دیکتاتۆریەتی چینی پڕۆلیتاریا    بۆ لەناوبردنی سیستەمی کاری کرێگرتە

# کۆمۆنیزم




**گۆڤاری کۆمۆنیزم**

ئۆرگانی سەنترالی گروپی کۆمۆنیستی ئینتەرناسیونالیست

Central organ of the Internationalist Communist Group ( ICG)

**ژمارە 6**

دیناری عێراقی ،6000    3ئیۆرۆ    4دۆلاری ئەمەریکی

# بابەتەکانی ئەم ژمارەیە

پێشەکی گۆڤاری ژمارە شەش

ڕاپەڕینی پڕۆلیتاریا لە تورکیادا (2013)

جەنگی ئینتەر بۆرجوازی لە سوریادا

بەیانێك لە بەڕازیلەوە : نەهێڵن کە ئاگری ڕاپەڕین دامرکێتەوە (2013)

بەیانێك لە کوردستانەوە لەسەر ڕاپەڕینی مانگی یەك لە سەیدسادق (2014)

ڕاپەڕینی پڕۆلیتاریا لە مانگی هەشت لە بەریتانیا (2011)ا



تورکیا 2013

# پێشەکی ژمارە شەشی گۆڤاری کۆمۆنیزم بە کوردی

ساڵێک زیاتر تێپەڕیوە بەسەر دەرکردنی ژمارە پێنجی گۆڤاری کۆمۆنیزم بەکوردی. بەڵام بابەتەکانی ئەو ژمارەیە لەسەر ڕاپەڕینەکانی ئەم سەردەمەی پڕۆلیتاریابوو لە ناوچەکەو دەرەوەی ناوچەکەدا. بەتایبەتی لەسەر هێزو لاوازیەکانی بزووتنەوەکەمان لە تونس و میسردا . لەم ساڵەدا خۆشبەختانە پڕۆلیتاریا لە تورکیاو بەڕازیلدا چاپتەرێکی تریان لە خەباتی چینایەتی تۆمارکردوو بزووتنەوە ئینتەرناسیووناليستەکەی پڕۆلیتاریای ئینتەرناسیوناليستيان برەو پێ دا. هەروەها پڕۆلیتاریا لە چەند شارێکی بەریتانیشادا هەمان هێزی نیشاندا. بابەتەکانی ژمارە شەش لەسەر لایەنەکانی ئەم بزووتنەوە ئینتەرناسیونالیستیەیە. بەم پێ یە ژمارە پێنج و ژمارە شەش دوو ساتی هەمان بزووتنەوەن و باس لە ووردەکاریەکانی ئەم بزووتنەوە چینایەتیە و بەرزو نزمیەکانی لە وولآتەکاندا ئەکات. بۆ ئەو هاوڕێیانەی کە ئاشنای زمانە جیهانیەکانی ئینگلیزی، ئیسپانی و فەرەنس هەن ئەتوانن ماددەی تر لەسەر ئەم بزووتنەوانەو لەسەرووردەکاریەکانی هەمان بزووتنەوە لە وولآتەکانی تردا ببینن لە گۆڤاری کۆمۆنیزم بەو زمانانە و کۆپی لە ئەدرێسە ئەلیکترۆنیکەکەماندا بلآوکراوەتەوە. هەروەکو ئەبینین ، وەلآمی بۆرجوازیەت لە هەموو وولآتەکاندا ئەوەیە کە چۆن ئەم بزووتنەوەیە سست بکات ، چەکی کات ، بیکات بە ماددەی دیمۆکراسیەت و جەنگی ئینتەر بۆرجوازی ( کوردو عەرەب. کوردو توورک. کوردو فارس. شیعەو سوونی ) . کە چۆن لەم جەنگە ئینتەر بۆرجوازیەدا پڕۆلیتاریا لە هەموو توانا چینایەتیەکانی ئەکرێت و دائەبڕێنرێت لە یەکتری و ئەکرێت بەگژ یەکتریدا و ئەبێت بە داردەست و خۆراکی جەنگەکان دژی ژیانی خۆیی و هاوڕێکانی و دژ بە بەرژەوەندیە چینایەتیەکانی. لەم تێکشکاندنەی بزووتنەوەکەدا حیزب و لەشکری ئیسلامی و نەتەوەیی و تیرۆری دەولەتان باڵ بەسەر ژیانی چەوساوەکاندا ئەکێشێت. سنوورو دەسەلاتدارانی نوێ سەرهەڵ ئەدەن و قەپاڵ بە یەکتریا ئەکەن. ئەوەی لەسەر پڕۆلیتاریا پێویستە ئەوەیە کە خۆی نەداتە دەست ئەم دیکتاتۆریەتەی سەرمایە. بڕوا بە چیرۆکە هەلبەستراوەکانی نەکات. تف لە هەموو لایەن و دیاردەکانی بکات. دەستی هاوکاری و هاوخەباتی درێژکات بۆ پڕۆلیتاریا لە هەموو لایەک . لەمڕۆی واقیعی کوردستاندا بەرژەوەندیە نەتەوەییەکانی بۆرجوازیەتی کوردی لە تیژ بوونەوەدایە لە ناوچەکەدا. ئەمەش هەم پڕۆلیتاریا لە کوردستاندا ئەبات بەرەو جەنگە ئیمپریالیستەکان ، کە وەکو بورکان لە ناوچەکەدا ئەکولێن . وە هەم بۆرجوازیەتی کوردی و هێزە ڕێکخراوەکانی ئەکاتە یەکێک لە هێزە سەرمەشقەکانی ئەم جەنگە. ئەوەی پشت لەم کارەساتە بکات بە خۆ فرۆش و تاوان بارو خوێڕی و شتی تر لەقەلەم ئەدرێت و نان بڕاوو سزا ئەدرێت. لەسەر پڕۆلیتاریا لە ناوچەکەدا پێویستە کە بەرەوڕووی ئەم کارەساتە بێتەوە پشتیوانی لە بۆرجوازیەکان نەکات و دەستی هاوو خەباتی بۆ هاوڕێ چینایەتیەکانی لە ئێران ، توورکیا ، ناوچە عەرەبیەکاندا درێژبکات و ڕێکخراووی تایبەت بەم بزووتننەوەیە پێک بێنێت. پڕۆلیتاریا لە تورکیادا لغاووی دەولەتی تورکی گرتووە لەم جەنگە ئیمپریالیستیەدا ( بڕوانە بابەتەکە لەسەر ئەم بزووتنەوەیە لەم ژمارەیەدا ) ، بەڵام بەهەموو گرنگیەکەیەوە ئەم بزووتنەوەیە بەتەنیا بەرگەناگرێت ئەگەر پڕۆلیتاریا لەناوچەکەدا هەمان و زیاتر نەکات. هەستانەکانی بزووتنەوەکەمان لەپەرەسەندندایە، هەروەها پلانەکانی جەنگی ئینتەر بۆرجوازیش. ئەم دوو تەووژمە لە کێشمە کێشمدان لەسەر ئاستی ئینتەرناسیونالیستی. بەبێ خۆ تیژ کردنەوەی بزووتنەوەکەمان لە هەموو لایەکەوە و خۆ ڕاپسکاندنی لە دیمۆکراسیەت ، لە بەرژەوەندیە بۆرجوازیەکان ، لە ناقەبەو دینەکان جەنگی ئینتەربۆرجواز ی نزیکتر و گەورەتر ئەبێتەوەو دیکتاتۆریەتی سەرمایە بە هەنە لەقێ ولەسەر بەرێەڕبردنی کارەساتە مرۆییەکان خۆی تازە ئەکاتەوە.

# تـــــــــــوركيـــــــــا

مانگی شەشی 2013

## کەلتوری ناسیونالیزم و کەلتووری ئیسلامیزم زۆر بەهێزە لەتورکیادا ، بەڵام ویستی ژیان ، دژی چەوساندنەوەی ئابووری و زوولم و زۆری دەولەت ، لەوان بەهێزترە

لە کۆتای مانگی پێنج و لە سەرەتای مانگی شەش دا بەیەکادانێکی بەرفراوان ڕوویدا لەنێوان پۆلیس و خۆپیشاندەرەکاندا . لە سەرەتادا لە شاری ئەستەمبولو دواتر تەشەنەی کرد بۆ پایەتەخت و ئەنتالیا و شار و شارۆچکەکانی تر
هۆی ڕاستەوخۆی ئەم هاتنە سەرجادەیە ی کرێکاران و قوتابیان و ئەوانەی کە پالە پەستۆی ئابووری ژیانی کۆمەڵایەتی لێ بڕی. بوون ، بەرگرتن بوو بە پەرەسەندنی ئابووری لە شاری ئەستەمبول دا . لەسەرتێکدانی پارکەکان و بڕینی بواری حەسانەوەی دانیشتوان بوو . دژی ئەوە بوو کە پارکێکی گەورە لە ناوجەرگەی شاردا بکرێت بە ناوچەیەکی پیشەسازی. بەڵام هەر بەزوویی و بەدەم بەیەکادانەکانەوە ئەم بەرگری کردنە لە حەسانەوە و هەناسەی ژیان گرێدرایەوە بە بیرەوەریەکانەوە . گرێ درایەوە بەوەوەی کە لە مانگی ئایاردا دەولەت قەدەغەی ئەوەی کردووە کە کرێکاران لە پارکەکەدا کۆبنەوە بۆ بیرەوەری یەکی ئایار ، بەڵام لە هەمان کاتدا ڕێگەی بە تیپەکانی تۆپی پێ داوە کە سەمای بردنەوەی یاریەکانی خۆیان لە پارکەکەدا ساز بکەن. گرێ درایەوە بەوەوە کە دەولەت ووردە ووردە هەول ئەدات کە "ئازادیە کۆمەڵایەتیەکان" قەدەغە بکات و ڕێگە بە خۆشەویستی کردن لە شوێنە گشتیەکاندا بگرێت. بەوەوە کە دەولەت دەزگاکانی ڕاگەیاندنی کۆنترۆل کردووە و هەر چیرۆکە هەلبەستراوەکانی خۆی بلاودەکاتەوە و باس لەلایەنەکانی ژیان ناکات. بەوەوە کە دەولەت لە پلانی ئەوەدایە کە ژیانی ڕۆژانەی گشتی بەپێی بەرنامە دینیەکان ڕێك بخات و . . .هتد



خۆپیشاندانەکان نەك هەر بەخێرایی بە وولآتەکەدا بلآو بووە ، بەلکو تا دەهات بەرفراوانتر و کۆمەلآیەتی تر دەبۆوە . بێزاری و تووڕەییەکانی ژیانی چەوساندنەوە ،کە چەندین ساڵە پەنگیءەخواتەوە ، بووە هێزێکی چاوونەترسی کۆمەلآیەتی و ڕژایە سەر شەقامەکان. هەزارەها لە پڕۆلیتاریاکان دابەزینە سەرجادەکان و کەوتنە شەڕی کۆلآن بە کۆلآن لەگەل پۆلیس دا . خۆپیشاندانەکان کرا بە پەلامار دان . سەرشەقامە سەرەکیەکان کرانە سەنگەر بە دژی هێزەکانی دەولەت. نەقابەکان وویستیان بەم بزووتنەوەیە بگەنەوە و مانگرتنی گشتیان لە تورکیادا ڕاگەیاند . بەلآم تەنها 200 هەزار کرێکار بەشداری لەم مانگرتنە گشتیەدا کرد . لە ئەستەنبولدا کرێکارانی مانگرتووی قوماسش و کرێکارانی هاتووچۆی ئاسمانی بە دەستە دەستە خۆیان گەیاندە مەیدانەکە ( ڕیپۆرتێ لە بلآوکراوەی ئەنارکیەکانەوە "کرێکارە تووڕەکانی دونیا " ۱.

دەولەت لەسەرەتادا بەهێزێکی زۆری پۆلیسەوە بەرەنگاری ئەم بزووتنەوەیە بووەوە . پۆلیس بەرەنگاری بزووتنەوەکە بۆوە بە گاز و ئاوی کیمیاوی و هەموو ئەو زەبروزەنگەی کە لە توانای دا بوو . ئەم زەبروو زەنگەی دەولەت لە بری ئەوەی بزووتنەوەکە دامرکێنێتەوە زیاتر تووڕەو بەرفراوانی کرد . دام و دەزگاکانی پۆلیس و دەزگاکانی ڕاگەیاندن پەلاماردران و ئامرازەکانی هاتووچۆکردن ئاگردران. ئەمە بۆ سێ ڕۆژ زیاتر بەردەوام بوو. پۆلیس زیاتر لە 130 هەزار گوولەی گازی هاوویشتوو ، نزیکەی 8 هەزار کەسیشی بریندار کرد . دلە ڕاوکێ و ترس بلآو بووە بە ناو هێزەکانی پۆلیس دا ، ناسیونالیست و ئیسلامیەکان کەوتنە تاوانبارکردنی یەکتری لە پەرلەمان و لە دەزگاکانی ڕاگەیاندندا . نزیکەی 150 لە پۆلیسەکان بەرپەرچی ئەوەیان دایەوە کە تەقە لە ڕاپەڕیوەکان بکەن و لکان بە بزووتنەوەکەوە . دەولەت بەشێوەیەکی کاتی لە شاری ئەستەنبول دا دۆڕانی و پاشەکشەی بە هێزەکانی پۆلیس کرد و بەشێك لە مەیدانەکانی بەیەکانی بەجێ هێشت بۆ بزووتنەوەکە . پۆلیس لە بری هێرش کردن کەوتە بەرگری کردن و خۆی لە دەوری بینا سەرەکیەکاندا قایم کرد.




لەهەمان کاتدا بزووتنەوەکە لە پایتەخت و شارەکانی تر جمەی بەیەکانی دێت لەگەل هێزەکانی دەولەت دا . لە ئەنقەرەدا خەباتگێران هەلیان کوتایە سەر بارەگاکانی پارلەمان و پارتی ئیسلامی زال و شەڕەکەیان ئاراستەی دام و دەزگا سیاسیەکان و یاساییەکان کرد.

لە هەموو لایەکەوە خەباتگێران ئەم سەرکەوتنە کاتیەیان کردە هێزی خۆڕێکخستن . شەقەکانان بوونە مەیدانی ڕێکخستن و کۆبوونەوەی بزووتنەوەکە . ژمارەیەکی زۆر لە هەموو لایەکەوە دابارینە سەرجادەکان . ئەمە دەرگای مەیدانەکانی خستە سەرپشت و دەولەتیش سوودی لەم جەماوەری بوونە وەرگرت و ناسیونالیست و ئیسلامیزم و ڕیفۆرمیستەکان و ژمارەیەکی زۆر لە

سیخووڕەکانی خستە ناو ئەم مەیدانانەوە . ئەمە بووە هۆی ئەوەی کە کەمایەتیە پەلامارەدەرەکان وورده وورده زەق بنەوەو پلانەکانیان هەنگاو بە هەنگاو بە پۆلیس بدرێ و ڕادیکالیەتی کردەوەکانیان بکەوێتە ژێر پالەپەستۆی تێکەلی بارودۆخەکەوە . ئەمە پالی بە بەشێك لە دەستە کەمایەتیەکانەوە نا کە پەلامارەکانیان بخەنە شەوو وبە تاریکی هێرشەکانیان ڕێك بخەن . ئەمە لە شاری ئەستەنبوول دا . بەڵام لە ئەنقەرەدا بزووتنەوەکە پەلاماری بارەگاکانی حکومەتیان دا و شەڕەکەیان بردە بەردەرگای پارلەمان . گفتوگۆ لەنێوان حکومەت و سەرانی نەقابی و سیاسی ناڕەزادا گەرم کرا بۆ تاووتوێ کردنی داواکاریەکان ، دەزگاکانی ڕاگەیاندنی جیهانی وورده وورده وەستان لە باسکردنی بارودۆخ لە تورکیا دا ، دیمۆکراسیەت جارێکی تر لەهەموو لایەکەوە هێرشی بە چۆکدادانی کردە سەر بزووتنەوەکە.




لەم شالآوە دیمۆکراسیەدا دەولەت هەولی دا کە هۆی ئەم تەقنەوە کۆمەلآیەتیە لە ژیان دوورخاتەوەو بیبەستێتەوە بەوەی کە ناکۆکی هەیە لە نێوان سێ هێزی سیاسی سەرەکی لە تورکیادا : ئیسلامیەکان ، ناسیونالیستەکان ، لیبرالەکان . ئەمانن کە ڕێناکەون لەسەر دەستوورو چۆنیەتی بەڕێوەبردنی دەولەت ، بۆیە هاوولآتیەکان دابەش بوون و ناڕەزایی دەرئەبڕن

لەگەل ئەوەشدا کە پرۆلیتاریا لە تورکیادا نەیتوانی هاتنە سەرجادە جەماوەریەکانی لەوە زیاتر برەوپێبدا ، دەولەتیش ئەوەی لە توانادا نەبوو کە نە بەهێز وە نە بە ڕیفۆرم کۆتایی بە ناڕەزاییەتیەکان بهێنێت . لەبەرئەوە هێشتا هۆیە سەرەکیەکانی ئەم بزووتنەوەیە وهەروەها ڕق و سووربوونی پرۆلیتاریاش بەزیندوویی ماوەتەوە.

دەستە کەمایەتیەکانی ئەم بزووتنەوەیە هیشتا سەرگەرمی پلاندانانی نهێنی و پەلامارەکانن لە شەودا ئەم بزووتنەوەیە لەئێستادا لەم ئاستەیدا دێت و دەچێت وپێمان دەلێت کە لەگەل ئەوەی کە لە ڕووی مێژوویەوە هێزی ڕێکخراوی ناسیونالیزم و ئیسلامیزم بەهێزە لە تورکیاداو دەولەتیان پتەو کردووە ، بەلآم ووزەی کۆمەلآیەتی ژیان دژ بە دیکتاتۆریەتی سەرمایە لە توانایدایە لەوان بەهێزەتر بێت . بۆ ساتێکیش بە کردەوە ئەو هێزە خۆی نیشاندا ، شان بەشانی هەمان هێز لە

یۆنان و میسرو تونس و بەرازیل و لەندەن سەیدسادق دا



دیکتاتۆریەتی سەرمایە و دەولەت لە تورکیادا جیاوازنی یە لەدیکتاتۆریەتی سەرمایە و دەولەت لە یۆنان و میسرو تونس و بەریتانیا و بەرازیل دا ، و پرۆلیتاریا لە تورکیادا هەمان ژیان و بەرژەوەندی هەیە لەگەل پرۆلیتاریا لەوولآتانەداو هاوخەباتیان ئەکات




پرۆلیتاریا لە تورکیادا بەئاگایە لەوەی کە دەولەتی تورکی ، لەپال ئیسرائیل و سعودیەدا ، رۆلێکی ئیمپریالیستی گەورەی هەیە لەناوچەکەدا ( بۆنموونە لە لیبیا و عێراق و سوریا و تونس و فەلەستین دا ) وە هەول ئەدات کە پرۆلیتاریا لە تورکیادا بکاتە جەندرمەی دەولەت و خۆراکی زیاتری دیکتاتۆریەتی بەها و بیکات بە گژ بەرژەوەندیە چینایەتەکانیدا و بەگژ

پرۆلیتاریای ڕاپەڕیوودا لە ناوچەکەدا . ئەم بزووتنەوەیەی لە بەرژەوەندیە چینایەتیەکانیەوە سەرچاوەی گرتووەو ڕاپەڕینەکە چینایەتیەوو دژ بە دیکتاتۆریەتی بەهاوجەنگە ئیمپریالیستیەکەیەتی لەناوچەکەدا



هەرلەم بەرژەوەندیە چینایەتیانەوەبوو کە ڕق و قینەی چەوساوەکان بەرامبەر بە دیکتاتۆریەتی سەرمایە وهاوخەباتی هێزی شۆڕشێگری ڕاپەڕیوەکان توانی دابەشبوونەکانی ژیانی ڕۆژانە وفۆڕمەکانی ئەو دابەشبوونە بشکێنێت ویەکگرتووی خەبات دژ بە تێرۆڕی دەولەت ڕابگەیەنێت . بۆنموونە دەولەت سەری لەوە دەرنەئەچوو کە چۆن لایەنگیرانی دوو تیپی فتبۆلی بەرامبەر بەیەك ، کە هەمیشە سنگیان لە یەکتری کوتاوەو پەلاماری یەکتریان داوە ، ئێستا شان بەشانی یەك و باقی پرۆرلیتاریاکانی تر لەسەرجادە شەڕی بەرامبەر بە دەولەت ئەکەن . لە لەندەنسشدا هەمان دیاردە ڕوویدا و پۆلیس لەوە تێنەیەگەیشت کە چۆن تاکەکانی سەر بە دەستە چەتەکانی بەرامبەر بەیەك لەم بزووتنەوەیەدا بوون بە هاوخەبات و پەلاماری پۆلیس ئەدەن و بەهاوبەشیی تالآن ئەکەن . چۆن ئەو گەنجانەی کە لەبنکە کۆمەلآیەتیەکاندان و لە ژێر چاودێری فێرکردنی دەولەتدان لەگەل ئەوانەی کە دەولەت کردوونی بە چاودێرو فێرکەر بەسەریانەوە لە و بنکانەدا فۆڕم و باجەکانی دەولەتیان فڕێداوەو بوون بە هاوخەبات و پێکە لەسەنگەرێکدان دژ بە دیکتاتۆریەتی ئابووری و دەولەت

لەبەرئەم هەلوێستە قولەی پرۆلیتاریایە کە لەگەل ئەوەی تورکیا ئەندامێکی بەتوانای چەکداری ڕێکخراوی ناتۆیە ، کەچی غیرەتی ئەوەی نی یە جەنگی ئیمپریالیستی لەناوچەکەدا تاوبدات بۆ ئاستێکی تروو بڕوا سوریا داگیر بکات و هێزەکانی لە ناوچەکەدا بە ئاشکرا تەڕاتێن پێ بکات ، وەکو سعودیە کردی لە بەحرێن ویەمەندا

**پرۆلیتاریا لە تورکیادا هەلبژاردن بە بەهێزکردنی دەولەت ئەبینێت . لەبەرئەوە نە ڕێز لە سەرئەنجامی هەلبژاردن ئەگرێت و نە چاوەڕوانی ئەوەشە کە داواکاریەکانی لە هەلبژاردنی داهاتوودا چارەسەر بکرێت . بزووتنەوەکە دژ بە هەلبژاردن و پێشبڕکێی سیاسی و پارلەمان بوو**

بەکورتی ، پرۆلیتاریا لە تورکیادا ڕاپەڕی : دژی دیکتاتۆریەتی ئابووری ، دژی زۆرەملێی دەولەت ، دژی تەشەنەسەندی بازاڕ لەسەر بوارەکانی ژیان ، دژی ئایدیۆلێجاو ڕێکخستنی ئیسلامیەکان بۆ ژیانی ڕۆژانە ، دژی بەیتووبالۆرەی دەزگاکانی ڕاگەیاندن ، دژی جەنگی ئیمپریالیستی ، دژی ناسیونالیزم و شانازی کردن بە دەولەتی تورکیەوە ، دژی ڕابردووی مل کەچ و دوورودرێژی قبوول کردن و بێدەنگی خۆی بەرامبەر بەمێژووی دیکتاتۆریەتی سەرمایە لە تورکیادا ، دژی ئەوەی کە تورکیا بکرێتە نموونەی کۆمەلگایەکی ڕازی و دەستوورێکی عادیلانە بۆ وولاتەکانی وەکو میسرو تونس و بزووتنەوە شۆڕشگێرەکەی لەو وولآتانەدا پێ کەلەپاچە بکرێت. ڕاپەڕی دژ بە دیکتاتۆریەتی سەرمایەو لە پێناووی ژیاندا.



لەسەرئاستی جیهانی ، سیستەمی سەرمایە دلی زۆر خۆش بوو بەباری ئاشستی کۆمەلآیەتی لە تورکیادا و بە ڕۆلی دەولەتی تورکی لەناوچکەدا . دەولەتی تورکیش پشتی تاڕادەیەك قایم بوو بە بێدەنگی و قایل بوونی پرۆلیتاریا لە تورکیادا . **ئەمهاتنە سەرجادەیەی پرۆلیتاریا "خیانەتێکی" گەورەبوو لەئاشتی کۆمەلآیەتی و لە خۆڕازی بوونی دەولەت. خەنجەر وەشاندن بوو لە دەولەت و جەنگی ئیمپریالیستی لەناوچەکەدا لە لووتکەی پەلهاویشتنیدا . جۆرێك بوو لە دیفیتیزمی شۆڕشگێڕی کۆمەلآیەتی و پەرەپێدان بوو بەڕاپەڕین لە ناوچەکەدا . بژی ئەم هوشیاریە چینایەتی و ئاراستە چینایەتیەی خەباتی پرۆلیتاریا لە هەموو لایەك. ئەمەیە کە ئەمان بات بەرەو شۆڕشە کۆمەلایەتیە جیهانیەکەمان و بەرەو کۆمۆنیزم .**

**بوارەکانی سەرمایە بۆ سەرکوتکردنی ئەم بزووتنەوەیە چیە لەم ڕۆدا؟**

کارتەکانی دەولەت لە ئێستادا ئەوەیە کە ناسیونالیزم و ئیسلامیزم وەك دوو هێزی ناڕەزای بەرامبەر بەیەك نیشان بدات. ئیسلامیزم بە ناموٚ لە دیموٚکراتیەت و دیموٚکراسیەت بە بەرگری کردن لە بەرژەوەندی هەمووان نیشانبدات. بەردەوام بێت لە پلانەئیمپریالیستیەکان لە ناوچەکەدا و بەدەست گرتن بەسەر ئابووری و چەکداری و سیاسی سوریا و عێراق و وولآتەکانی نزیك خوٚی بواری تەقینەوەکان کەم کاتەوە. شەڕەکان بکاتە کێشەی سیاسی و هەلبژاردن و بییات بەرەو دادگای هەلبژاردن و دەنگدان. شەڕەکە بکات بە بابەتی جیاکردنەوەی دین لە دەولەت، جیاکردنەوەی دەزگاکانی ڕاگەیاندن لە ئیسلام و حیزبە سیاسیەکان، زیادکردنی ئازادیە فەردیەکان و کەم کردنەوەی چاودێری دەولەت بوٚ ژیانی ڕوٚژانەی هاووولآتیان. هەروەها بابەتی کورد و کەمایەتیە نەتەوەییەکانی تر تاوو بدات. بەم شێوەیە بتوانێت ئەم بزووتنەوەیە لە پەل و پوٚ بخات. بەلآم ئەم هێزەی دەولەت هەر بە تورکیاوە پەیوەند نییە و پرۆلیتاریاش لە تورکیادا دانەبڕاوە لە باری ناوچەکە.

بزووتنەوەکە لە ناوچەکەدا گەرمە و پرۆلیتاریاش لە تورکیادا بەخوٚیا ئەچێتەوە و بیر لەوە ئەکاتەوە هەنگاوی داهاتووی چی بێت. بەربەرەکانێکان هەن، پەرش و بلآون، مەنگە، بەلآم زوٚر زیندوو ترسناکە. تا چەند ئەم ململانێیە و ڕادیکالیەت و جەماوەری بوونەوەی بزووتنەوەی پرۆلیتاریا تەجاوەزئەم پرۆگرامی دیکتاتوٚریەتی سەرمایە ئەکات ئەوە پێوەری نیشانەکانی داهاتووی بزووتنەوەکەیە



تورکیا و بەرازیل ئەو دوو موٚدێلە بوو لە بەڕێوەبردنی دیکتاتوٚریەتی ئابووری کە شانازیان بە خوٚیانەوە ئەکرد لە چا و ئەوروپا و ئەمەریکا و دا و سەریان بەرز بوو لە مڕوٚی بازاری جیهانی دا. ئابووری ناسەکانی جیهانیش پشتوانیان لێدەکردن و بانگێشەیان بوٚ دەکردن وەك "ئابووریەکی کوٚمەلآیەتی"، "جێگیر بوونێکی سیایسی" و "پەرلەمانی ئازاد" کە پێویستە بکرێتە نموونە بوٚ ئەو وولآتانەی کە لە باری ئابووری و سیاسی و کوٚمەلایەتی دا لە تەنگەنەفەسی دان. ئەم بزووتنەوە چینایەتیەی پرۆلیتاریا

. ، هەروەکو بزووتنەوەکە لە تونس دا ، ئەم بۆچوون وئاواتە بۆرجوازیەی بەدرۆخستەوە



بەپێی هەواڵە ڕەسمیەکان خۆیان:

بەیەکادانەکان بە کۆبوونەوەی گێرەشێوێنان لەمەیدانی تەقسیم لەشاری ئەستەمبوول دا وداگیرکردنی ئەومەیدانە لە 31 - مەی 2013دا دەستی پێکرد.

هێزەکانی دەولەت بە ئاوو گازی کیمیاووی و دارکاری کردن پەلاماری گێرەشێوێنەکانیان دا

لێشاووی گێرەشێوێنەکان تا دەهات زیاتر دەبووەوە بەماوەیەکی کورت بووە پەلامارێکی جەماوەری دژ بە هێزەکانی دەولەت

ڕاپەڕین بلاوبووەوە بەسەرتاپای وولاتەکەدا

دەستە دوودلەکانی پۆلیس پاشەکشەیان کرد لە مەیدان وجادەکاندا و خۆیان لەدەوری دام ودەزگاکان قایم کرد

زیاتر لە 150 لەهێـــزکانی هێرش بەری پۆلیس تەنیا لە شاری ئەستەنبول دا یاخی بوون لە لەفەرمانی ئەوەی کە تەقە لە گێرەشێوێنەکان بکەن وهاتنە ناو خۆپیشاندەرەکانەوە

دەولەت سیخوورێکی زۆری ناردە ناو بزووتنەوەکەوە و ڕیفۆرمیستەکان و دیمۆکراسی خوازەکان دەستیان خستە دەستی حکومەت بۆ ڕێکەوتن

لە 10ی جوندا داگیرکردنی شارەکان کۆتایی هات و مەیدانەکان پاککرانەوە

گێرەشێوینەکان بەدەستەی بچووك بچووك خەریکی پەلاماردانن لەشەودا

بەیەکادانەکان کزبوونەتەوە بەلام نە بەرەسمی ونە بە نارەسمی کۆتاییان پێ نەهاتووە . ئەوخەریکی هەنگاونانە بۆ ئاستێکی ترو بەدوای ساتێکی تردا ئەگەڕێت کە بێتەوە مەیدان

بە سێ چوار ڕۆش دوای ڕاپەڕین لە تورکیادا ، پڕۆلیتاریا لە بەرازیل دایاخی بووە داباریە سەر شەقەماکەن وبەکردەوە دژ بە دیکتاتۆریەتی ئابووری ڕاپەڕی . ئەوان بە لێشاو پەلاماری دام و دەزگاکانیان داو شوێنە گشتیەکانیان کۆنترۆل کرد .
بەمایەکی کورت پڕۆلیتاریا توانی تەشەنە بە بزووتنەوەکەی بدات و سەرکەوتنی کاتی بەدەست بێنێت . بزووتنەوەکە بە سەرتاپای وولاتدا بەئاستی جیاواز بلاوبووەوە
دەولەت کەوتە پەلە قاژەو بڕیاری دا کە نرخی هاتووچۆ کردن هەرزان بکات . بەلام پڕۆلیتاریا داوای ئەوەی ئەکرد کەنرخەکان .بکرێن بە "سفر" وهاتووچۆ ببێتە خۆڕایی

ئەم بزووتنەوەیە دژی تەنگەنەفەس بوونی ژیانی پڕۆلیتاریاکان بوو لە پەرەسەندنی ئابووری جیهانیدا ، کە ئابووری بەرازیل یەکێکە لە نموونە کارامەکانی . ئەوان دژی ئەوە بوون کە کرێکاری ژیانێکی بەردەوامیان ناداتێ لە پەرەسەندنی ئابووری لە بەرازیل دا . گڕانی پێویستەکانی ژیان وتەنگوچەلەمەی هاتووچۆ و دوورکەوتنەوەی توانای کرێکاران لە دابینکردنی ژیانی ڕۆژانە هۆی .سەرەکی ئەم تەقینەوەیە بوو

**ئەم بزووتنەوەیە ، هەروەکو لە تورکیادا ، لە تونسدا ، لەمیسردا ، لە یۆناندا ، بۆ ئازادکردنی ژیان بوو لە دیکتاتۆریەتی سەرمایە** . بۆ ڕزگارکردنی کرێکاران بوو لە چەوسادنەوەو تەنگوچەلەمەکانی ڕۆژانە . دژی بوونی پەیوەندی دەولەمەندی و فەقیری بوو . بەکردەوە ئەوەی نیشاندا کە هەلبژاردن و بوونی ڕێکخراوە سیاسیەکان و دەزگاکانی ڕاگەیاندن وەسیلەی دەولەتن بۆ ڕێکخستنی چەوساندنەوەی ژیان و ئەبێت تێك بشکرێنێت . **بزووتنەوەکە ، لە هەردوو وولاتەکەدا ، بە سەربەزی بەرپەرچی لە خۆبایی دیکتاتۆریەتی جیهانی سەرمایەو ، پەرەسەندنی چەوساندنەوە وپێشکەوتنی ئابووری لە هەردوو .وولاتەکەدا دایەوە**

ئەم دوو بزووتنەوەیە بەبێ چەندوچوون ، پڕوپاگاندەی ئابووری ناسەکان و قاچ لێڕاکێشانی سۆشیال دیمۆکراتەکان و شانازی کردنەکانیان بەباری سیاسی و ئابووری لەو دوو وولاتەدا پووچەل کردەوە . ئەوان بەبێ دوودلی سەربەرزی "وولاتەکانیان" لە بازاڕی جیهانی دا خستە سەرچۆك و ڕاستەوخۆ هاوبەرژەوەندی چینایەتی و هاوخەباتیان لەگەل پڕۆلیتاریای خەباتگێڕ لە یۆنان و تونس و میسر و وولاتەکانی تردا ڕاگەیاند
**ئەوان نا نیشتمانی ونا هاوولاتی خۆیان نیشاندا بەرامبەر بەچەوساندنەوەی چینایەتی لە ژیاندا . پشتیان کردە نەتەوەو نیشتمان وئابووری نەتەوەیی و دین و جەنگە ئینتەر بۆرجوازیەکان ، وە ڕوویان کردە ژیان و بوون و وویستە چینایەتیە جیهانیە هاوبەشەکانیان**

پڕۆلیتاریا لە تورکیادا هاتە مەیدان دژ بەوەی کە ژیانی ڕۆژانەی تەنگەنەفەس بووە لەژێر پالەپەستۆی ئابووری ، زۆرداری دەولەت ، پڕوپاگەندەی ڕاگەیاندن ، جەنگی ئیمپریالیستی لە ناوچەکەدا ، ڕۆلی تورکیا لەسەرکوتکردنی ئاگری ڕاپەڕین لە لیبیا و میسر و عێراق و سوریا و وولاەکانی تری ناوچەکەد ، وە تەدریب پێکردنی ئیسلامی و دەستەکانی تری دژە شۆرش لەناوچەکەدا

لە تورکیادا پڕۆلیتاریا هاتەمەیدان دژ بەوەی کە پەرەسەندنی ئابووری وولات سەوزاییەکانی وولاتی لێزەووت ئەکات . ئاوو سەرچاوەکانی بەختەوەری ژیانی لێ ئەبات و ئەیکات بە کالاو ئیفرۆشێتەوە بەوەی کە توانای کڕینی هەیە . کە پەرلەمان و هەلبژاردن ولایەنەکانی سەر بەم پڕۆسیسەی دیکتاتۆریەتی ئابوورین و ئیشیان ئەوەیە کە ئەمە لەژیانی ئەمدا ڕەسمی و قانوونی بکەنەوە . کەپۆلیس پاریزگاری ئەم بەڕەسمی بوونە ئەکات و ئیشی ئەوەیە نەهێلێت کەس لێ لابات . کە دەزگاکانی ڕاگەیاندن

بەشان و بالی دەولەتدا هەل ئەدەن و باسی ژیان ناکەن و درۆو دەلەسەکان بلاوئەکەنەوەو ئیشەکەیان لەکارخستنی مێشکی سەربەخۆی ئەمانە . دەولەت بەگەرمی سەرگەرمی جەنگی ئیمپریالیستی یە لە ناوچەکەدا و ڕۆژانە پڕۆلیتاریا لە تورکیادا زیاتر ئەبات بەرەو قولآی ئەم جەنگە

بەکورتی پڕۆلیتاریا لە تورکیادا ڕاپەری دژ بە دیکتاتۆریەتی ئابووری و هەلبژاردن و پووچەلی ڕۆژنامەگەری و دەستدرێژی پۆلیس و بە ئیسلامکردنی پەیوەندیەکانی ژیان

داوای ئەوەی ئەکرد کە بوارەکانی ژیان زیاتر بکرێتەوە ، ئیش و چەوساندنەوە و تێکدانی ژیان بووستێت ، کە سەرکوتکردنی دەولەت کەم بێتەوە ، یاساکانی بە ئیسلامی کردنی پەیوەندیەکانی ژیان پووچەل بکرێتەوە ، دەزگاکانی ڕاگەیاندن بووەستن لە هەلبەستن و ووتنەوەی درۆکان و بکەونە باس کردنی ژیان ، دەولەت لەسەرکوتکردنی پڕۆلیتاریا لە ناوچەکەدا پاشەکشێکات و واز لە جەنگی ئیمپریالیستی و چەکدارکردنی هێزەکانی دژە شۆڕش لە ناوچەکەدا بێنێت . **ئەم دواکاریانەش مەحالە لە سنووری سەرمایەدا بەدی بێت ، بۆیە سەرئەنجامە سرووشتەیەکەی خەباتی زیاتر و شۆڕشی جیهانی و کۆمۆنیزمە**

لە تورکیادا پۆلیس شارەکانی ئەستەمبوول و ئەنقەرەو ئەنتالیا و دیاربەکر و شارو شاروچکە ڕاپەڕیوەکانی تری کردۆتە مەیدانی جەنگی کیمیای و ئاگر لە خۆپیشاندەران و هەلمەت بەران بەرئەدات . پڕولیتاریاش تادێت زیاتر سوور بوونی خۆبی و خۆبەدەستەوەنەدانی بۆ ئەم سەرکوتکردنەی پۆلیس ڕائەگەیەنێت . ئەم هەلوێستەی پڕۆلیتاریا لە تورکیادا بەستراوەتەوە بە باری ڕاپەڕیووی پڕۆلیتاریا لەناوچەکەدا ، بەتایەتی میسر ، هەروەها پڕۆلیتاریا لە یۆنان و بەرازیلدا دەستخۆشکەری لە پڕۆلیتاریا لە تورکیادا ئەکەن و هاوخەباتی خۆیان دەرئەبڕن بەرامبەریان . ئەم لەیەکدانەوەیەی بزووتنەوەکان ئیشی بۆرجوازیەکانی قورس کردووە . شەڕەکەی بردۆتە ئاستێکی واکە ئاو پیاکردن و کوژاندنەی ئاسان نی یە بۆ دەولەت

**بەربەرەکانێکانی ئەم دوایەی پڕۆلیتاریا لەمیسردا ، دژی هەلبژاردن و ئیسلامیەکان و ئاگربەردانە بارەگاکانی پارتی زالی ئیسلامی و یەکگرتووی حکومەتی تورکیا لەگەل پارتی زال لە میسردا ، هانی پڕۆلیتاریای لە تورکیادا داکە بەرپەرچی پارتی ئیسلامی زال لە تورکیادا بداتەوەو ڕاپەڕێت دژی پلانە ئابووری و سیاسی و ئایدیۆلۆجی و ڕێکخستنە کۆمەلآیەتەکانی . ئەم هاتنەمەیدانی پڕۆلیتاریا لە تورکیادا دیسانەوە گۆڕێکی گەورەی دا بە بزووتنەوەکە لەناوچەکەدا و بەتایبەتی لە میسر و تونسی دا بەرامبەر بە پارتی ئیسلامی زال کە وورەیان لە تورکیاوە وەرئەگرت . ئەم یەکگرتنە ناوچەیەی پڕۆلیتاریا ئەو ئەمەلەی بۆرجوازیەتی جیهانی شکاند کە ئەیویست جەماوەریەتی ئیسلامیەکان و هەلبژاردنەکانیان لە تورکیا و میسر و تونس دا بکرێت بە مۆدێل و وەسیلەی ئەمەلگام کردنی پڕۆلیتاریا و پەرەپێدانی ئابووری لەسەریەوە**

**لە ئێستادا پڕۆلیتاریا لە میسردا ئیسلامیەکانی هێناوەتە سەرچۆك ، بەلآم ناسیونالیستەکان و سوپایەکە بەرهەمەکەیان کۆکردۆتەوە ، ئەمەش ئەگەڕێتەوە بۆ هەلوێستەکانی پڕۆلیتاریا بەرامبەر بە سوپا لەسەرەتای ڕاپەڕیندا .** بۆڕوونکردنەوەی ئەم لایەنە ئەتوانن سەیری گۆڤاری کۆمۆنیزمی ژمارە پێنج بەکوردی بکەن

نە بە کیمیای و ئاگروکوشتنەوە نە بە هەلبژاردن و گفتو و بەخشیش . پۆلیس لە تێکشکاندن و پاشەکشێدایەو سۆشیالدیمۆکراتەکانیش بە گاگۆلکێ و دەستی خالی بەرەوڕوی ئەم بزووتنەوەیە بوونەتەوە

چەندین سالە تورکیا شان بەشانی ئیسرائیل و سعودیە و میسر شەڕی ئیمپریالیستی لەناوچەکەدا خۆش ئەکەن و سەرمایەبی

لەسەر کۆ ئەکەنە ( بڕوانە عێراق فەلەستین لیبیا لوبنان ) . بوورجوازیەکانی ئەوروپا و ئەمەریکا لە ڕێگەی ئەم وولآتانەوەیە کە چەندین ساڵە شەڕ لە ناوچەکەدا خۆش ئەکەن. بە کۆمەڵ قەتل و عامی پڕۆلیتا لە ناوچەکەدا ئەکەن و ئیسلامیزم و زایۆنیزم وناشیونالیزم برەو پێ ئەدەن. ڕاپەڕینی پڕۆلیتاریا لەمیسر و دواتر لە تورکیادا خۆڕاپسکاندنێکی بەهێزبوو دژ بەم واقیعە زاڵەی دژە شۆڕش لە ناوچەکەدا . بەم پێیە ئەم بزووتنەوەیە هەم گورزێکی بەهێزی وەشاند لەم واقعە زاڵەو لەو بەرژەوەندیانەی کە لەسەری ئەژین، وەهەم دەرگای خستە سەرپشت بۆ ڕاپەڕینی زیاتر لە ناوچەکەدا دژی ئەم مێژووە

هەموومان ئەوە ئەزانین کە **مێژووی ئیسلامیزم و ناسیونالیزم هەروەها هێزی سوپا و پۆلیس بەهێزە لە تورکیادا ، بەڵآن ئەم بزووتنەوەیە ئەوەی نیشاندا کە تووڕەی هێزی ژیان و یەکێتی چەوساوەکان بۆ ئازادی ئەتوانێت لەوان بەهێز تر بێت. ئاگری ڕاپەڕین هەموو لایەکی گرتۆتەوە و سنوورەکانی بڕیوە و لەیەکیداوەتەوە ، کوژانەوەشی ئاسان نیە و بۆرجوازیەکانی هەموو وولآتەکان لە دلەڕاوکێدان. بۆرجوازیەت نە ئەتوانێت لە چەوساندنەوە بووەستێت و نە ئەشتوایێتن بە بێ شەڕ بەردەوامی پێ بدات**



**بڕوخێت دیکتاتۆریەتی ئابووری**

**بڕوخێت جەنگی ئیمپریالیستی**

**بڕوخێت دین و دەولەت بەهەموو ڕێکخراوەکانیەوە**

**بەرەو شۆڕشی کۆمەڵآیەتی ژیان لەسەر ئاستی جیهانی**

# جەنگی ئینتەربۆرجوازی ولایەنەکانی لە سوریادا

لە سوریادا ، بەرپابوونی ڕاپەڕین وهاتنەسەرجادەی گەنجەکان لە شاروشارۆچکەکاندا (لە سەرەتادا لە شاری دەرعا و دواتر بۆ شاروشارۆچکەکانی تر) ، وە بەردباران کردن وپەلاماردانیان بۆ سەرهێزەکانی ئاسایش ودام ودەزگاکانی دەولەت، ئەتوانرێت هەم لەڕووی بلاوبوونەوەی ئەم سەردەمەی شەپۆلی خەباتی پرۆلیتاریا لە ناوچەکەدا کە لە تونسەوە دەستی پێکرد ، وە هەم لەڕووی یاخی بوونی چەوساوەکان لە سووریادا لە مێژووی جەنگ و سەرکوتکردن وچەوساندنەوەی چینایەتی و تیرۆری دەولەت ( هەروەکو عێراق لە 1991 دا ) سیر بکرێت. لە هەر ڕوویەکەوە بۆی دێت ئەم خەباتە ، هەروەکو ئەوەی لە یەمەن و میسرو تونس ویۆنان دا ،یاخی بوونە لە ژیانی کاری کرێ کرتە ، لە دمۆکراسیەت ،لە خاوەنداریەتی ، لە دەولەمەندی وفەقیری ،لە بەرزوونزمیە ئابووری و سیاسی و سەربازی وئاسایشیەکانی ئەم ژیانە . لە بەرئەوەی ئەم ژیانە سیستەمێکی ئینتەرناسیونالیستیە ، بەرزوو نزمیەکانی لەسەرئاستی جیهانی شەپۆل ئەدەن، دیاردە ناوخۆیی وناوچەیەکانی لەو شەپۆلەدا بەریەك ئەکەون، ئەسوێن وخۆیان تازەئەکەنەوە ، بە گشتیش دیکتاتۆریەتی سەرمایە ئەنوێنن، خەباتیش بە دژی خەباتێکی چینایەتی پرۆلیتاریایەوسەر بەوشەپۆلەیە لەخەباتی ئینتەرناسیونالیستی کە پرۆلیتاریا لەم ڕۆدا تیا ئەژی دژی دیکتاتۆریەتی جیهانی سەرمایە . گۆڕەپانی ئەم خەباتە سیستەمی کاری کرێ گرتەیە ، دوژمنەکەی دیکتاتۆریەتی جیهانی سەرمایەیە ، بەهەموودام ودەزگا ئابووری و سیاسی و دینی و نەتەوەیە جۆراوجۆرەکانیەوە . ە



March 21, 2011 دادگایەکی سووتاو بەدەستی ڕاپەڕیوان لە شاری دەرعە

ئەم خەباتە هەرلە تونسەوە تاکو میسر ، لە فەرەنساوە تاکو یەمەن، لە بەریتانیاوە تاکو تورکیا ،لە بەرازیلەوە تاکو جنوبی ئەفەریقیا ، بەکورتی لەسەرئاستی هەموو ولآتەکان، لە ئارادایە دژی چەوساندنەوە ، دژی نەبوونی ، دژی جەنگ، دژی کرێکاری ، دژی ئابووری، دژی پیس بوونی ژینگە ، دژی خوێندن ، دژی دین و ئایدیۆلۆجیەکانی تر ، دژی مەمرەو مەژی ڕۆژانە ، دژی کۆنترۆل و زۆرداری دەولەت . ئەم لایەنانە هەموویان لایەنی سیستەمی کاری کرێ گرتەو دیکتاتۆریەتی جیهانی سەرمایەن و بەئاستی جۆراوجۆر زەق ئەبنەوە و ئەکەونە بەرپەلامارەکانی پرۆلیتاریا لە وولآتەکاندا . ئەم خەباتە بۆ تێکشکاندنی ئەم سیستەمەیەو لە لایەنە زالەکانەوە بۆی ئەچێت. شقارتەکەی بەولایەنەوە ئەنێت و لەوێوە ئاگرەکە خۆش ئەکات کە لێی توورەیەو زەقبۆتەوە لەبەردەمیا وچەندساڵە ئەوە لەبەردەمیا خەستبۆتەوە . دژە شۆرش ئەمە ئەزانێت وئیش بۆ ئەوە ئەکات کە یەکەم ئەم خەباتە هەرگیز سەرهەڵنەدات، دووەم ئەگەر سەری هەلدا بتوانێت بیکات بەشەری تەنیا بەرامبەر بە لایەنە زەق بووەکان و لەو

ئاستەدا ڕای گرێت و لە باری بەرێت. لە بری ئەوەی ئەو خەباتە دیکتاتۆریەتی سەرمایە تێك بشكێنێت، دیکتاتۆریەتی سەرمایە تێكشكاندنەكەی ئەو خەباتە ئەکاتەوە بە هێزی دینامیکی خۆی. دروستکردنی هێزە جۆراوجۆرەکان و شانۆگەریە سیاسیەکان و بەرپاکردنی جەنگەکان، هەموویان بەرگری کردنی دیکتاتۆریەتی جیهانی سەرمایەیە لەخۆی دژی ئەم خەباتە جیهانیە چینایەتیەیە و دەستی هەموو وولآتەکانی تیدایە و لەلایەن هێزو ڕێکخراوە تایبەتیەکانی ئەو وولآتانەوە بەڕێوەئەبرێ




ئەوەی ئەمڕۆ لە تونس و میسر و یەمەن و تورکیا و سوریا و ئۆکرانیادا ڕوو ئەدات، وە دوێنێ لە لوبنان و فەلەستین و عێراق و ئێراندا ڕوویدا، مل ملانێی نێوان ئەم خەباتە جیهانییەی پرۆلیتاریا و وەڵآمی دیکتاتۆریەتی جیهانی سەرمایەیە بۆ ئەو خەباتە لەم خەباتانەدا پرۆلیتاریا ڕاستەوخۆ خەریکی تێكشكاندنی لایەنەکانی دیکتاتۆریەتی سەرمایەیە. لە هەر ڕوویەکەوە تێبڕوانی ئەو داوای ژیانێکی کۆمەڵآیەتی بێ چەوساندنەوە ئەکات. بەرامبەر بەم وویست و هێزە چینایەتیەش هێزە کۆن و نوێیەکانی دیکتاتۆریەتی سەرمایە، لەلایەك پێکەوە ئەخۆنەوە و لە لایەکی تریشەوە یەخەی یەکتری ڕائەکێشن، لەسەر ئەوەی کە چۆن بەرگری لە بەرژەوەندی ئەم سیستەمە جیهانیە بکەن و چۆن ئەم خەباتانە بۆ کۆمۆنیزم تێکبشکێنن و پارچەکانی بکەنەوە بە خۆراکی سەرمایە و درێژکردنەوەی ئەم بەرژەوەندیە جیهانیە. چۆن بە شێوەیەکی تایبەتیش پاداشتی خۆیان وەرگرن و بەرهەمەکەی کۆبکەنەوە و بەشی کەن. کێ بێت و کێ بڕوات. کێ بخوات و کێ تەماشاکات. هاوکاری و ڕاکێش ڕاکێشی نێوان بەریتانیا و فەرەنسا و ئەمەریکا و ڕوسیا و ئەلەمانیا و چین و هندستان و تورکیا و بەرازیل و سعودیە و ئێران و میسر و قەتەر و . . . هتد سەر بەم دینامیکەی جیهانی دیکتاتۆریەتی سەرمایە و تاوتوێکردنی هێزەکانیەتی. بەبێ بەرژەوەندیە تایبەتیەکان، لە چواچێوە و دینامیکی جیهانی بەرژەوەندیە گشتیەکەدا، پێشبڕکێکان ناتوانن هەبن و جەمسەرگیری دروست نابێت و دیموکراسیەت لە ئارادا نابێت و جەنگی ئینتەر بۆرجوازی پێك نایەت، بۆ ئەوەی بەرژەوەندیە تایبەتیەکان بکەن بە میکانیزمی تێکشکاندنی خەباتەکان و بە دینامیکی کەلەپچە کردنەوەی پرۆلیتاریا لە بەرژەوەندیە جیهانیەکەی دیکتاتۆریەتی سەرمایە



FSA leader, and former [Colonel](), [Riad al-Asaad]() and others announcing the FSA's formation in late July 2011 ا



خۆپیشاندان لەشاری Hula, نزیك بە Homs 14 October 2011

بەهۆی ئامادەبوونی دەولەتەکان ( بەتایبەتی ئێران، تورکیا ، سعودیەو ئیسرائیل و سوریا خۆشی ) ، وە خوێندنەوەی بەردەوامیان بۆ هێزوو لاوازیەکانی بزووتنەوەی پرۆلیتاریا لە ناوچەکەدا ، وە ئاستی بەرزوو نزمی ئەم بزووتنەوەیە لە ئوردن و یەمەن و تونس و میسردا ، زەق بوونەوەی لاوازیەکانی ، ئەمە هێزی دەستپێشخەری کردنی دایە هێزەکانی دژە شۆرش لە ناوچەکەدا بۆ کردنی لاوازیەکانی بزووتنەوەکە بە جەنگی ئینتەر بۆرجوازی ، بە شەڕی شیعەو سونی ، بەخەبات بۆ دیمۆکراسیەت ، بە خەباتی

دژی سیاسەتی حیزبی حاکم، بەخەباتی نیشتمانپەروەری دژی داگیرکەر

بەهۆی ئەم زەمینە دەستپێشخەریەوە کاتێك کە پرۆلیتاریا هاتە سەرجادەکان لەسوریادا، دەولەتی سوریا و تورکیا و ئێران و سعودیە و ئەوانی تر دەمێك بوو هێزەکانی خۆیانیان ئامادەکردبوو بۆ بەرەنگاری بوونەوەی هێزە چینایەتیەکانی ئەم بزووتنەوەیە و قۆستنەوە و ئەمەلگام کردنی لاوازیەکانی لە شەرێکی ئینتەر بۆرجوازی دا. ئەمە هەر لە سوریادا نییە، بەر لە سوریا، لە ئۆردوندا شەڕەکان بەریان پێگیرا بەرێکەوتنی نێوان شا و ئیسلامیەکان، لە تونسدا فەرەنسا ئیسلامیەکانی هێنایە سەر تەخت و هێزی تیرۆریزمی دەولەتی خستەدەستیان (هەروەکو ئێران لە 1977دا)، لە میسردا بە دوو قۆناغدا بەرێوەچوو، یەکەم بە رێککەوتنی نێوان ئیسلامیەکان و سوپا بۆ بەرگرتن بە رادیکال بوونەوە و کۆمەلآیەتی بوونەوەی بزووتنەوەکە، بە هێنانە سەر تەختی ئیسلامیەکان، دووەم بە بەربەرەکانێی نێوان سوپا و ئیسلامیەکان، وەکو دوو لایەنی دژ بەیەك، وە کودەتای سوپا بەسەر ئیسلامیەکانداو تیرۆری سوپا بە دژی بەربەرەکانێ و رەگەزە شۆرشگێریەکان لە سەر ئاستی وولآت. لە بەحرین دا بە خەباتی کەمایەتی بۆ مافە دیموکراتیەکانیان. لە یەمەندا بە خەباتی بەرامبەر بە یەك خێزانی دیکتاتۆر و لابردنی، لە سووریاشدا بەشەڕی نێوان دژە ئەسەد و دژە داگیرکەر



Minister of Defense General Dawood Rajiha visits Russian aircaft carrier, January 8-2011

بەلام بۆچی ئەم شەرە لە سووریادا، هەروەکو لە عێراقدا لەسەردەمی سەددام دا، لە لیبیادا لەسەردەمی قەزافی دا بەداگیرکردن و پێشبڕکێیی سەربازی خەست کرایەوە؟ کەچی لە تونس و جەزائیر و ئۆردن و مەغریب و یەمەن و میسردا بە شێوەکانی تر بەردەوامە؟ چونکە لەرووی سەربازی و سیاسی و ئابووریەوە وە دەولەتی سووریا دەمێکە نەك هەر لە پەلهاوویشتن وەستاوە، بەلکو لە پاشەکشەدایە لە ئیشکردنی لە لوبنان و فەلەستین و عێراق و کوردستانی تورکیا و لە بەرامبەر ئیسرائیل دا.

پاشەکشیەك کەسووریای خستە سەرپشت بۆ پێشبڕکێیی هێزەکان لە ناوچەکەدا



**Syrian opposition** first congress in Tunis, 19 December 2011

لە ڕابردوودا سووریا لە توانایدا بووکە کێشەکانی بەستێتەوە بە لوبنان و ئیسرائیل و عێراق و فەلەستینەوەو و ناڕەزایەتیەکانی سەبارەت بە چەوساندنەوە و جەنگ و نەبوونی و کۆنترۆلی دەولەت بهاڕێت لەم پرۆسیسەدا . بەڵام بە لەدەستدانی ئەم زەمینەیەو بەخەست بوونەوەی ناڕەزایەتیەکان و پێشبڕکێ سەربازیەکان لە ناوچەکەدا ناکۆییەکانی سەبارەت بە ژیان و کۆنترۆلی دەولەت بواریان بۆ ڕەخسا کە بەئاستی جۆراو جۆر خۆیان دەربڕن و بچن بەگژ هێزەکانی دەولەت دا . هەروەها بواریش بۆ دەولەتەکانی ناوچەکە ڕەخسا کە ئەوە لە سووریادا بکەن کە چەندین سالە سووریا لە تورکیاو فەلەستین و لوبنان و عێراقدا ئەیکات . لێرەدا هەم سووپای سووریا کۆنترۆلی سنورەکانی لەدەست دا وە هەم هێزە ناڕەزاکانی ناوسووریا وسەرسنوورەکان بوون بە داردەستی تورکیا و سعودیە و هێزەکانی تر لە ناوچەکەدا . بزووتنەوەی دژی چەوساندنەوە و لە پێناوی ژیاندا کەوتە بەر شالآوی ئەم جەمسەرگەریە ئیمپریالیستیە . بەرگری کردن لە وولآت ، گۆڕانی حکومەت ، ئایدیۆلۆجیای دینی ، مافی کەمایەتی و گۆڕانکاری دیمۆکراسی ، بوون بە دروشمە بۆرجوازیەکانی ئەم جەمسەرگەریە . وولآتەکانی ناوچەکەو دەرەوەی ناوچەکە چەك و تەقەمەنیەکی زۆریان خستە ئەم شەڕەوە ، و شەڕەکەشیان کرد بە "حیزامی ئەمنی" بۆ پارێزگاری کردنی خۆیان . بۆ ئەمەلگامکردنی (قۆستنەوەی) بابەتی و زاتی ئەم ئاستەی بزووتنەوەشۆرشگێڕیەکان لە تونس و میسرو یەمەن و ئۆردندا و بەرگرتن بە سەرهەلدانی بزووتنەوەی زیاتر لە لوبنان و تورکیا و وولآتەکانی تر لەناوچەکەدا . ( لێرەدا زۆر پێویستە ئەوە بلێین کە بە پێچەوانەی ئەم وویست و پلانە ئینتەربۆرجوازیە وە ، پرۆلیتاریا لە توورکیادا ڕاپەڕی و ڕادەی بۆ ئەم قەپالەی دەولەتەکان دانا . بڕوانە نووسینەکەمان لەسەر ئەم بابەتە لەم ژمارەیەدا )ا

لەم جەمسەرگەری و کێشمە کێشمە ئینتەربۆرجوازیەدا ، هێزە ئیسلامیەکان ، بەسەرپەرشتی تورکیا و ئێران و سعودیە ، بوونە تە لایەنێکی سەرەکی لە زۆربەی وولآتەکاندا . لە بەر ئەوە ڕاکێشانیان بۆ بەربەرەکانێ لەسەر دەسەلآت و بۆ سەر دەسەلآت خۆی ( لە دەسەلآتی مزگەوت و کۆلآنەکانەوە بۆ دەسەلآتی بالآتر ) بۆتە شانۆگەریەکی جیهانی و گرنگێکی گەورەی پێ ئەدرێ. لەم شەڕە ئینتەربۆرجوازیەدا ، **ئایدیۆلۆجیی ئیسلامی و ڕێکخراوە ئیسلامیەکانی ئەم سەردەمە ، کراونەتە گورزێکی دووسەرە . لە سەرێکەوە جادەو کۆلآن و دام و دەزگاکانیان پێ پاکە کریتەوە لە ڕێکخراوە پرۆلیتاری و نا ئیسلامیەکان و بوونەتە پۆلیسی سەرمایەو وبەرگری لەکاری کرێ گرتەو ژیانی چەوساندنەوەو ملکەچ بوون ئەکەن و داوای زیاتر خۆڕاگری مرۆیی و قوربانی دانی مرۆیی و لەزەتی دەکەن. ئەم بوونەی ئیسلامیەکانە کە سەرمایەداری لە هەموونەتەوەکاندا ڕێزی لێ ئەگرێت و پێویستی پێ یەتی. ئەمە بۆ ئەمرۆی سەرمایە هەرئاوکردن نی یە بە ئاگری پرۆلیتاریادا ، بەلکو خەساندنی پرۆلیتاریایە بۆ چەندین سالی تری. لە لایەکی ترەوە گەورەیان ئەکەن بۆ جەمسەرگەری و جەنگی درێژخایانی ئینتەربۆرجوازی. هەروەها بۆ**

**جەمسەرگەری وهاندانی هەموودین وئایدیۆلۆجیە کۆمەلآیەتیەکانی تر لەسەرئاستی جیهانی : گاورەکان، جوولەکەکان، ولق وپۆپەکانی تر. هەروەها ڕێکخراوە سەربازیە نێودەولەتیەکانیش بەرژەوەندیان لەوەدایە کە چەك بفرۆشن وبال ڕاکێشن لەناوچەکەدا** . بۆنموونە ڕێکخراوی ناتۆ وبنکە بەستنی زیاتری لە ناوچەکەدا



دەولەتانی ئەندامی ڕێکخراوی ناتۆ پیاچوونەوەیەکی باش دەکەن بە پەیوەندیەکانیان وچۆنیەتی پاراستنی بەرژەوەندیەکانیان لە ناوچەکەدا . ئەوان سەرگەرمی کردنەوەی بوار و ڕێگای ترن بۆ هاتووچۆ بازرگانی ونەوتی و گازو ئاوویەکان ، هەم بۆ بەردەوامی وویستی بازاری جیهانی وهەم بۆ گارانتی ووزە لە کاتی درووست بوونی قەیرانەکان لە ناوچەکەدا . وولآتەکانی تورکیا وقەتەروسعودیە سەرنیزوهێزدەری ئەم تاووتوێکدنەن لە تاوچەکەدا . تاکو جموجۆلی بازرگانی نەوتی لە رۆژ هەلاتی ناوەراست دا،بۆیە دەاەنەوی رەگایەکی تر لە تورکیاوە بەرەو کەنداو بە ریگای ووشکانی بکەنەوە ،کە سوریاباشترین ریگایە لە ناوچەکەدا وە گەیاندنی ئاوی شیرین بۆ دەولەتانی خلیج وهینانی نەوت وگازیش لە و یوەبۆ سەر **دەریای سپی ناوەڕاس** ست.وەلەلایەکی تر ئەیانەوی هەیمەنەی ئیرانی وروسی لەناوچەکە دا کەمبکەنەوە .. هەروەها لەبەر ئەوەی چربونەوەیەکی گەورەی سەربازی وئابوری زۆر هەیە لە خلیج دا،کەبە تەقینەوەی وەزعیک یان ئەزمەیەکی ناوچەکە ،گەورەترین کیشە بۆ بۆرژوازی جیهانی دروست دەبیت لە باری ئالوگۆری بازرگانی وسەرچاوەی نەوت وسوتەمەنی و سەرفکردنی چەک ، بۆیە بۆرژوازی عالەمی نایەوی پشت ببەستی بە یەک دەروازە کە ئاوی کەنداوە خۆ ئەگەر لە بەرزەوەندی سەرمایە بشکیتەوە ئامادەن نەخشەی ناوچەکە دەست کاری بکەن وگۆرانکاری تیادا بکەن . بۆیە ئەوەی روودەدا شەری ئیمپریالیە وهیچ. شەری لایەنە بۆرژوازیەکانەلە سەر حسابی هەژار ونەدارەکانی سوریا وناوچەکەش،وە هەرچی لە دەستیان بیت ئەیکەن بۆ ئەوەیشتی نەبی بە ناوی خەباتی پرۆلیتاریا وشەری چەوساوەکان بەلام خۆش بەختانە بە پیچەوانەی ویستی بۆرژوازی وا پرۆلیتاریا لە ئەستەمبول و شارەکانی تری تورکیا ،ئەمەی بەدرۆ خستەوە (سەیری مەقالەی تورکیا بکە لە هەمان ژمارەدا

**بەکورتی ولە چەند خالێکدا مەرامە بۆرجوازیەکان بریتیە لە :**

ڕێکخستنەوەی جوگرافیای سیاسی ناوچەکە دوای جەنگی جیهانی دووەم

درێژکردنەوەی ڕێکخراوی ناتو بۆ کەنداوی عەرەبی - فارسی

تاودانی هاوکاری کردنی ئابووری نێوان تورکیا و وولاتانی خلیج

دەستگرتن بەسەر تەواوی بەندەرەکانی ڕۆژئاوای دەریای سپی ناوەڕاست

خۆبەدەستەوەدانی سوریا و لوبنان بۆ ئەم هەلپە سەربازی - ئابووری - سیاسیە

ڕاکێشانی ئاووی توورکیا بۆ وولاتانی کەنداو نەوتی کەنداو بۆ دەریای ناوەڕاست و تورکیا

دەرهێنانی سوریا - لوبنانان - عێراق لەژێر چنگی ئێراندا

کەمکردنەوەی گرنگی کەنداوی فارسی و ناردنەدەرەوەی نەوتی عێراق و ولاتانی کەنداو

لەڕێی دەریای ناوزەڕاستەوە

لەحالەتی بەرپابوونی جەنگ لەناوچەکەداو داخستنی کەنداو بەرهەمهێنانی نەوت و گازی

ناوچەك نەوەستێت

سوپای سووریا دەسەلاتی بەسەر جوگرافیای وولاتەکەدا لەق بوو. سنوورەکان کراوە بوون ،

بۆ گروپە چەکدارەکانی ناوچەکە ، ئەمەش دەرگای بۆ تەراتێنی چەکداری لەناوچەکەدا خستبۆ سەرپشت و دەستە

ناڕەزاکانی توورکیا و ئۆردن و لوبنان و عێراق ئەو سنوورانەیان کردبووە پەناگاو نەفەسی پەیوەندیکردن

کۆنترۆل کۆدنی تورکیا و سعودیە و ناتۆ بۆ سوریا کۆنترۆل کردنی لوبنان و عێراق و هەموو بەندەرەکانی ناوچەبی دەریای سپی

ناوەڕاستە

بۆ رکخراوە ئیسلامیەکانی سەر بە سعودیە و تورکیا و ناتۆ هەم زەمینەی خۆڕێخستنەوەی سیاسی و چەکداریانە وەهەم

مەیدانی بەکوشتدانی هەزارەها لەوگەنجانەیانە کە دوای پڕوپاگاندە جیهانیەکانیان کەوتوون بەتایبەتی یەمەنیەکان

میسریەکان عێراقیەکان ئۆردوونیەکان و بەکرێگیراوەکانی سەر بە سعودیە و قەتەر بەمەش پارێزگاری کردن ئەو وولاتانە

لەناوەوە لە پالەپەستۆ کۆمەلآیەتەکان کردنی ئەو وولاتانە بەپالەوانی یاریدەدەری زولم لێکراوەکان لە سووریادانەك

بەبەرپرسیاری تەنگووچەلەکان لە ناوخۆی ئەم وولاتانە خۆیاندا

**بڕوخێت دیمۆکراسیەت**

**بڕوخێت جەنگی ئێنتەر بۆرجوازی لە هەموو شوێنێك**

**بژی خەباتی ئینتەرناسیونالیستی پڕۆلیتاریا بەهەموو ئاستەکانیەوە**

**بەرەو شۆڕشی کۆمۆنیزم و کۆمەلگای بێ سەرمایە و بێ چەوساندنەوە و بێ دەولەت**

### بەیانێك لە بەرازیلەوە

# نەهێڵن کە ئاگری ڕاپەڕین دامرکێتەوە

کرێکاران لە بەرازیل دا سەرگەرمی شەڕێکی مێژووین لە دژی سیستەمی سەرمایەداری ، دژی دەولەت. سەردار و سەروەرەکان هەول ئەدەن کە خەباتەکەمان سارد بکەنەوە بە وەی کە چەند فلسێك بەنە سەر خەرجیەکانمان بۆ کرێی پاس ، وە پڕوپاگەندەی بەخشینەوەی شیینیەکان ئەکەن بەسەر ئەوانەدا کە بەرەنگاری سیتەمەکە بوونەتەوە.

تەشەنە پێدانی ئەم ڕاپەڕینە کارێکی دەست بەجێیە و کەمتەرخەمی ناوێت ، هەروەها تێهەلدان لە وانەی کە لەناومانـدا ئیشی دوژمن ئەکەن: حیزبیەکان، نەقابەچیەکان، بزووتنەوەی بەخواریی کردنی هاتووچۆ ، نیشتمان پەروەرو ناسیونالیستەکانی دەستەی " بەرازیل لە خەووهەستە " . ئەمانە لە خزمەتی مەرامەکانی بۆرجوازیەتدان: ئەوانیان ، خەریکی لیەنگری وە یان خەریکی پوچەل کردنەوەی سیاسەتەکانی یەکتیی ، ئەپارێنەوە بۆ دەرکردنی یاسا نوێیەکان بۆئەوەی بچنە ناو دەسەلتەوە و بەربە خەباتی دژی سیستەمەکە بگرن.

، ئەم بزووتنەوەیە ووزەی تەقنەوەکەی لە کاریگەری ئەزمە ئابووریەکەوە وەرگرت: لە هەل ئاوسانی ئابووری بەرزبوونەوەی نرخی زیندەگی ، نرخی خواردەمەنی ، وهاتووچۆ ، هەروەها زەبروزەنگی بەردەوامی پۆلیس: دژی سەرکوتکردنی خۆپیشاندانەکەی 13 ی جون لە ساووپاولۆ. ئەمە جگە لە شەپۆلی پەلامارە شەقاوەییەکانی پۆلیس: هاتووچۆ قەدەغەکردن، شالآوی قەتل و عام کردن، ئاگر بەردانە ئۆردووگاکان، کوشتنی کرێکارە بەرەچەلەك لادێییەکانی ناوچەکان. ئەم جۆرە کردەوانە ئەبێت چ سەرئەنامێکی تری لێ بکەوێتەوە جگە لەوەی کە ڕوو بدا ؟

لەدوای هەفدەی جوونەوە کرێکاران خۆیان ، بە دەر لە پارت و نەقابەکان، ڕاپەڕینەکەیان بردە ڕێ دا . سەر بەخۆیی بۆ هەموو ئەو کرێکارانەی کە لە خەباتدان ! ئەبێت ڕاستەوخۆ دەستنیشانی هەموو ئەو گروپانە بکرێت کە بزووتنەوەکە تەسلیم بە پۆلیس ئەکەن: ئەوانەی کە بەدوای پارتەکان و نەقابەکانەوەن و سەرانی ئەمانە ئەخەنە شوێن بۆسەکان ( پایەدارەکان ) ، ئەوانەی کە هەول ئەدەن خەبات بۆ ئازادی ، بۆ کۆمەلگای بی پایەدار و بێ حکومەت و نا یەکسانی بە لاڕێدا بەرن

ڕاپەڕینە کە لە ماوەیەکی زۆر کورتدا بلاو بووەوە بە هەموو وولآتەکەدا ، بە لآم ئەم ڕاپەڕینە بەربلآوە تەنها کاتێك ئەتوانێت سەرکەوتن بەدەست بێنێت کە ڕێکخراوە کرێکاریە شۆڕشگێڕیەکان خۆیان ، بەدەر لە دەست تێوەردانی بۆرجوازی و سەروەرەکان، سەرمەشقی بن . ئەم ڕاپەڕینە هەر ئەبێت هەستێت بە خۆڕێکخست بە دژووە لە سەرئاستی مەیدانەکانی ئیش ، گەڕەکەکان و خوێندنگاکان . ئەبێت هەستێت بە داگیکردن و لەئیش خستنی کارگەکان، کێلگەکان، زانکۆکان ، بازاڕە سیەرەکیەکان، هەستێت بە ڕێکخستنی ڕێپێوان و داگیکرنی شەقام و کۆلآنەکان بە دەستەچەکداریەکانەو و بانگەواز کردنی بەشداربوونی گشتی لەم ڕاپەڕینەدا . هاندانی هاتنە سەرجادە لە ئۆردووگاکانـدا و دەورو بەری شاردا ، کردن بەیەکی ڕێپێوانەکەی ناوشارو دەرەوەی شارەکان (ئەوانەی کە بەرەنگاری دەولەت بونەتەوەو ، پەلاماری پۆلیس و کۆمپانیا ، بە کۆمپانیا ئینتەرپرایسی هاتووچۆکانیشەو و پارت و نەقابەو مەخزەنە گەورەکان ئەدەن ئەوانە کرێکارانی هۆشیار و بەئاگان و خەبات دژی سیستەمەکە ئەکەن.

ئەندام و دەزگا حکومیەکان، دەزگاو ئەنـدامانی میدیا ، ئیم پی ئێل ، نیشتمان پەروەرە ڕاستڕەوە فاشیستەکان ئەمانە هەموویان سیخوورن و بۆ دەولەت ئیش ئەکەن. ئەمانە دێن و بە مەبەستی پەرەوازە کردنی بزووتنەوەکە پەلاماری ئەو کرێکارە خۆپیشاندەرانە ئەدەن کە لە شارۆچکە و ئۆردووگاکانەوە هاتوون، هەڕەشەی یاسایی و دەست تاوان باری بۆ خۆپیشاندەرەکان درێژئەکەن. هەول ئەدەن کە هەلەتەکانی دژ بە دەولەت بەرێ بگرن و بە لاڕێدا بەرن

سەروەرەکان تەنیا ئەوکاتە ترسیان لێنیشت وکەوتنە لەرزین کە بینیان بزووتنەوەکە تا بێت ژمارەی زیاد ئەکات و بە زەبروزەنگت ئەبێت. ئەوکاتەی کە ئەم بزووتنەوەیە هەستا بە ڕێکخستنی مەفرەزە چەکدارەکانی ( بۆ گرتنی کۆمپانیا و شەقامەکان، بۆ تێکدانی ئابووری ) وکەوتە فەرهوود کردن.
بەمەش کرێکاران ئەوەیان لە حکومەت و بۆسەکان ئەسەندنەوە کە چەندین ساڵە ئەوان لەمانی ئەبەن. ئامانجەکانی ئەم فەرهوود کردنانە زۆر دیاری کراون و ئەوە نی‌یە کە کرێکاران پەلاماری یەکتری بەن

.هاوڕێیان، ئەبێت ووریا بین چونکە فرو فێل ڕێکخراوە لەناو خۆپیشاندانەکاندا. هەڵمەتی لەناکاو بکەرە سەر ئەو شوێنانەو لەوکاتانەدا کە چاودێری کردن کزە، . خۆپیشاندان و مانگرتنەکان ڕێکخە بەبێ ئەوەی لە پێشەوە ئاگاداری دەسەڵاتداران بکەیتەوە
ئەم بزووتنەوەیە تەشەنەی سەند بەیارمەتی ئەوکرێکارانەی کە تەکنەلۆجیای تازە بەکاردێنن. بەڵام ئەم تەکنۆلوجیایە ئەتوانرێت بە دژی ئێمەش بەکار بێت: لە بیست و بست ویەکی جون دا حکومەت فەیس بووکی داخست، وە لە 10 جولآی دا، یەك ڕۆژ بەر لە "مانگرتنی گشتی" نەقابەکان، ئینتەرنێت کوژێنرایەوە. دوژمن ئەیەوێت بزووتنەوەکە لە حالەتی هەستان و کوژانەوەدا دەرنەچێت وکاتی ئەوەی نەبێت کە هۆشیاری و خۆڕێکخستنەکەی بکاتە خەباتێکی درێژخایان.
پێویستە زۆربەی گروپە هەڵمەت بەروو شۆڕشگێڕەکان هێز بکەن بەیەك و پەیوەندی پێك بێنن: ئەمە درێژە دەدات بە خۆپیشاندان و خەباتەکە لە حالەتی دامرکانەوەیدا. هاوڕێیان، هاوخەباتی و هاوکاری پێك بێنە لە گەل خەباتگێڕەکان لە وولآتەکانی تردا ( ئەوەی کە نیشتمانپەروەرەکانی ئەم وولآتانە نایانەوێت ڕووبدات ) : خەباتەکان لە تورکیادا، لە بوولگاریادا، لە سوویدا، لە باکوری ئەفەریقا و ڕۆژهەلآتی ناوەڕاستدا، هەمووی دژی هەمان دوژمنە : دیکتاتۆریەتی سەرمایەو دەولەت. پەیوەندی بکە بە خۆپیشاندەرانەوە لە وولآتەکانی تردا، بەتایبەتی کە ئەوە ئەیبینی ڕاپەڕین گەشتۆتە پاراگوای، چیلی، کۆلۆمبیا و پیرۆ و دەزگاکانی ڕاگەیاندن هەرباسیشی ناکەن

شەڕ بکە دژی پارتەکان، نەقابەکان، ئێم پی ئێل، نیشتمانپەروەران، "بەڕازیل لە خەوو ڕاپەڕە" وهەموو دەس بڕەکانی تر!!
نەخەریکی شانۆگەری دەمشین کردن و نە بەناو مانگرتنی گشتی بە کە نەقابەکان داوای ئەکەن بۆ ساردکردنەوەی خۆپیشاندانەکان!
لەبری ئەوە، شەقامەکان بگرە، دەست بگرە بەسەر کێلگەو شوێنەکانی ئیشدا! ئۆردوگاو قەزاو ناحیەکان خڕ کەرەوە و بیانکە بەیەك بزووتنەوە

**مردن بۆ سەرمایەداری و دەولەت! شۆڕش چارە سەرەکەیە**

Universal Revolution, July 2013.
**revolucaouniversal@yahoo.com**

### بەیانێك لە كوردستانی عێراقەوە

# ڕاپەڕینەكەی شارۆچكەی سەیدسادق و دەوروبەری لەسەرەتای مانگی یەكی سالی 2014

بەپێی دان پێدانانەكانی هەموو لایە نە ڕەسیمیەكانی ناوچەكە (یەكێتی، گۆڕان، ئیسلامیەكان) ، بەیەكادانەكانی سێ ڕۆژی شارۆچكەی سەیدسادق و دەوروبەری ، كە لە سەرەتای مانگی یەكی سالی 2014، ڕووی دا ، لەسەر دابینكردنی پێداویستیەكانی ژیان و دژ بەو دەسەلآتە ئابووری-سیاسی -كۆمەلآیەتیە كوردی - ئیسلامیە بوو كە لە ناوچەكەدا زالە و تەراتێن بە هێزوو ووزە و ژیانی دانیشتوانی ناوچەكەوە ئەكات.

زۆربەی بەشداربووانی ئەم بزووتنەوە تووڕەیە ئەو كەسانە بوون كە بێزاربوون لە چاوەڕوانی، و بێ بڕوابووبوون بە پرۆسەی هەلبژاردن ، و بە بەلێنەكانی لایەنە سیاسیەكان. كە ئەبینن چۆن پەرەسەندنی ئابووری و كەلەكە بوونی سەرمایە بەبەردەوام ژیانی مرۆییان ڕا ئەچەكێنێت و تەسكی ئەكاتەوەو لە سروشتی ناوچەكەو لە یەكتریان دا ئەبڕێت. ئەو ئاوو هەواو زەوی و زار و شاخ و داخ و دەرامەتەی كە بیست سالێك لەمەوبەر نیمچە خۆڕایی و بۆ هەموان بوو ، ئێستا لە ژێر دەستی سەرمایەدارەكاندا یەو بەو نامۆیە و هەتا بێت خراپتریش ئەبێت.

زۆربەی بەشداربوانی ئەم بزووتنەوەیە بەشێوەیەكی خێزانی و كەلتووری سەر بە حیزب و ڕێكخراوە جۆراوجۆرەكانی ناوچەكە بوون كە لە پەرلەمان و دەرەوەی پارلەماندا شەڕی دەسلآتیان ئەكرد. بۆیە ئەم كردەوەیەیان هەم خۆ دەربازكردنیان بوو لەو ڕابردووە بۆگەنە وە هەم تەجاواز كردنێك بوو دژ بە بوونی هەموو ڕێكخراوەكانی ناوچەكەو جیاوازیەكانیان( ئیسلامی ، كوردی، پێشكەوتن خواز، گۆڕان و . . هتد )

بەرژەوەندیە هاوبەشەكانیان یەكی خستن و هەموویان هەلیان كوتایە سەر دام و دەزگا ڕەسمیەكان و ڕژانە سەر شەقامەكان . قوتابیانی كۆلێجوو زانكۆوو سەرو سەرەتاییەكان بایكۆتی تاقیكردنەوە گشتیەكانیان كردوو ڕژانە ناو بزووتنەوەكەوە .

هێزەكانی ئاسایش لە هەموو لایەكەوە گەمارۆی ناوچەكەیان داو هاتووچۆی ناوچەكەیان خستە ژێر كۆنترۆلی تایبەتەوە. پارلەمان تاران و دەزگاكانی ڕاگەیاندن و سیخوورەكان چوونە نزیك ڕاپەڕیوان و هانیان ئەدان بۆ گفتوو گۆو گەڕانەوە بۆ ڕێڕەوە یاساییەكان.

هێزەكانی ئاسایش و دژە تیرۆر بە تەقەو گازی كیمیاووی و قومبەلە هاوویشتن بۆ مالەكان و گەڕەكەكان هەم بەرەنگاریان لە سەنگەرەكانیان ئەكرد وە هەم پەلاماری ڕاپەڕیوەكانیان ئەدا . تەقە لە ناو ڕاپەڕینەكانیشەوە دژ بەم سەركوتكردنە دەستی پێكرد .

لە هەمان كاتدا پشتكری كردن لەلایەن ئەندامانی ئۆپۆزیسیۆنەوە لە ناوچەكەدا بۆ دارشتنەوەی داواكاریەكانی ئەم بزووتنەوەیە ، وە ڕەخنە لە توونـدو تیژی ئاسایش و توونـدو تیژی خۆپیشاندەران دەستی پێكرد. ئاسایش بە ئاشكرا ڕایگەیاندن كە توانای كۆنترۆل كردنی بارو دۆخەكەی نی یەو شەڕەكان تا بێت قوول ترو خوێناوی تر ئەبنەوە .

پار لەمان تارو ناوچە گەریەكان وویستیان ئەم بزووتنەوەیە بۆ ژیان بكەن بە شەڕی نێوان بوون بە پاریزگاری هەلەبجەو دواكەوتوی ئاوەدانكردنەوە لە سەیدسادق دا . لە خۆشبەختی و ئاوالەیی بەشداربووانی ئەم بزووتنەوەیەو لایەنگیرەكانی دا ئەم پلانە بڕی نەكردوو دانیشتوانی ناوچەكە ( هەلەبجەو سەیدسادق و دەوروبەری) نەچوونە ژێر باری ئەم جەنگە ناوچەگەریەوەو ڕایان گەیانـد كە هیچ بەرژەوەندیەكیا ن لەگەل ئەم پلانەدا نیە .

بە دان پێدانانی هێزەکانی ئاسایش و پیاوە دینیەکان و ئەندامانی پەرلەمانی ناوچەکە خۆیان گەنجەکانی ناو بزووتنەوەکە بە هیچ جۆرێك نایەنەوێت گفتوو گۆ بکەن و داوای دەست بەجێی جێبەجێکردنی داواکاریەکانیان ئەکەن: چوونە دەرەوەی هێزەکانی ئاسایش و دەست لەکار کێشانەوەی قائیمقام سەرۆکی شارەوانی و بەڕێوەبەری پەروەردە، کە هەر یەکەیان سەر بە لیستی حیزبێکی سیاسی جیاواز بوو.
حکومەتی هەرێم وەفدێکی لەدەرەوەی ناوچەکەوە ڕەوانەی ناوچەکە کرد بۆ گوێگرتن لە داواکاریەکان و هەولی جێبەجێکردنیان. بزووتنەوەکە لێرەدا چەقیی و تەشەنەی نەکرد بۆ هەلەبجەو دەربەندیخان و عەربەت و سلێمانی.
ئەم بزووتنەوەیە بۆ ژیان هاوتابوو لە گەل بزووتنەوەکانی تری پرۆلیتاریا بۆ ژیان لە تورکیا و بەرازیل و تونس و میسر و بەریتانیا و یۆناندا. هەم ئەوانەی کە ڕاپەڕی بوون هاو خەبات بوون لەگەل ڕاپەڕیوەکان لەو وولآتانەدا، هەم بەرژەوەندیەکانیان هاوبەش بوو، هەم وەسیلەکانی خەباتیان هاوو شێوەبوو، وە هەم ئەوانەی کە دووژمنیان بوون (سەرمایەدارەکا، پلەدارو پایەدارەکان، سیاسی و پارلەمان تارو دینیەکان).

هەروەکو تونس و تورکیاو بەرازیل ، لەگەل بوژانەوەیەکی بازرگانی و ئاوەدانکردنەوەیەکی بەهێز و لەئارادابوونی پارەوپوولێکی زۆر لە کوردستاندا، کەچی جەماوەری پرۆلیتاریا لە زۆربەی ڕووەوە فریای ژیانێکی ڕۆژانەی سادەو بەتەندروستی ناکەوێ. بەدەستێك کرێکەی وەرئەگرێت و بە چەندین دەست دای ئەنێتەوە. بە بەرچاوویشیانەوە دەولەمەندەکان زیاتر موولکو مال ئەنێن بەیەکەوەو باخ و ڤێللا ئەڕازێننەوە و سەیارەی گڕان بەها تەراتێن پێ ئەکەن.
پێداوویستیەکانی ژیان (جیگەو ڕێگە، هاتووچۆ، تەندرووستی، خواردن و خواردنەوە) تابێت بەرەو گرانی لەلایەك و دابەزینی جۆرەکەی لەلایەکی ترەوە دەڕوات.
پرۆلیتاریا دژی ئەم دیکتاتۆریەتەی سەرمایە ڕاپەڕی. لەسەر ئاستی جیهانی هەموو شەڕەکانی پرۆلیتاریا چیینایەتیەو و لە پیناوی ژیاندایەو دژ بە دیکتاتۆریەتی ئابووری و لایەنە سیاسی و دینی و یاسایی و پۆلیسیەکانیەتی. دانیشتوانی سەید سادق و شاروو شارۆچکەکانی تری کوردستان دژی ئەوەن کە نازانن چۆن ئەژین، چەند ئەژین وە کەی تووشی نەخۆشی ترسناك ئەبن و بەچی ئەمرن. کە ژیان و ژینگەکەیان بۆتە تاقیگاو مەیدانی بازرگانی سەرمایەدارە کوردو توورك و فارس و هندی و عەرەب و ئینگلیز و ئەلەمانیەکان. کە خواردن و دەرمان و کەلوو پەلە بەسەرچووەکان ئەکەن بە قووڕگی چەوساوەکاندا. دژ بەوەن کە کراونەتە خۆراکی جەنگە ناوچەیەکان و ناوچەکانیان کراونەتە سەربازگایەکی گەورە (سەیتەرەکان لەچواردەور، تەیارەکان بەئاسمانەوە و سیخووڕەکان لە شووێنەکانی ئیش و گەڕەکەکاندا) وە هەتا بێت خراپتریش ئەبێت. ئەوەی نقەشی لێ بێت ئەوە تیرۆریستەو ئەبێت سزای خۆی وەرگرێت

**لەیەکدانەوەی کرداری وهووشیاری ئەم بزووتنەوانەمان بە بزووتنەوەکانی ترمانەوە لە ناوچەکەو دەرەوەی ناوچەکە ئەرکی دەستبەجێ وزامنی بەرەوپێش چوونمانە**
**بژی وە بەرفراوان بێت ئەم خەباتەمان لە سەر ئاستی جیهانی**
**بەرەو شۆڕشی کۆمۆنیستی جیهانی ، کە تاکە وەلآمی یەکلاکەرەو دوا ڕاپەڕینی سەرتاپایمانە دژ بە دیکتاتۆریەتی سەرمایە وهەموو کارەساتەکانی**
**بژی کۆمۆنەی مرۆڤایەتی بێ سنوور**

**Universal Revolution 2014**

## بەریتانیا مانگی هەشتی 2011
## یاخی بوون لە لەندەن و شارەکانی تری بەریتانیادا

لەمانگی هەشتی سالی 2011دا راپەرین لە ناوچەکانی لەندەن ، بێرمینگەهام ، لیڤەرپوول ، بریستۆل ومانشیستێر بەرپابوو



( the August riots in the UK . rioting spreads across the UK ) London August 2011

ئەم بزووتنەوەیە لە کاتێکدا بووکە ڕاپەڕین لە یۆنان و تونس و میسرو چەندین وولآتی تردا ماوەیەك بوو بەردەوام بوو . هێزە ئاسایش و سیاسیەکانی بەریتانیاش، لە پال فەرەنسا و ئەمەریکا و تورکیا و سعودیە دا ، بەڕاستەوخۆیی ئیشیان ئەکرد بۆ تێکشکاندنی ئەم ڕاپەڕینانە . بەر لەوەش چەندین سال بوو خۆپیشاندان و بەیەکادانەکان و ئاگر تێبەردان لە شارەکانی بەریتانیادا ، لە زیندانەکان و ئۆردوگا پەناهندەکانیدا ، لە ئارادابووە . ئەم بزووتنەوانە ئەتەقینەوە لە دژی شەڕی ئیمپریالیستی لە عێراقدا ، لە دژی گرانی و دابەزینی ئاستی زیندەگی ڕۆژانەی کرێکاران ، لە دژی بە دەولەمەندی وفەقیری ، لە دژی بێ هیوایی گشتی و چەوساندنەوەی بەردەوام و زیندانکردن و کۆنترۆلی پۆلیس . (بۆڕونکردنەوەی زیاتر لەسەر ئاست و وورده کاریەکانی ئەم بزووتنەوانە ، بڕوانە نووسینەکەمان لە ژمارە پێنجی گۆڤاری کۆمۆنیزم بەکوردی

ئەگەر لەم زەمینەیەوە سەیری بکەین، ئەم بزووتنەوەیەی مانگی هەشتی 2011ش بریتی یە لە یاخی بوونێکی تر لە مێژووی چەوساندنەوەی کۆمەلآیەتی سەرمایە لەم وولآتەدا ، وە جۆرێکە لە یەکگرتنەوە وهاوبەرژەوەندی کرن لەگەل ئەو

ڕاپەڕینانەی تردا کە لە دژی هەمان چەوساندنەوەی چینایەتی وەك گێژەلووکە لەسەر ئاستی جیهان ئەخولێتەوە . بەم پێیە ئەم یاخی بوونە لە دیکتاتۆریەتی بەهاو بەدژی لایەنەکانی ئەم دیکتاتۆریەتە خۆڕاپسکاندنی ڕاستەوخۆی پرۆلیتاریایە لەدژی کۆیلایەتی و لە پێناوی ژیاندا . خەباتی ڕاستەوخۆی پرۆلیتاریایە لە دژی چەوساندنەوە ، لە دژی کەلەکەبوونی سەرمایەو بەرهەمەکان ، لەدژی داماووی ژیان ، لەدژی دەولەت



London August 2011

هەروەکو ڕاپەڕینەکەی تونس ، چیرۆکی ئەم تەقینەوەیەش لە کارەساتێکی تایبەتەوە دەستی پێکرد کە لەناوچەی تۆتنهامی شاری لەندەندا ڕووی دا.

لە سەرەتای مانگی هەشتی سالی 2011دا مەفرەزەیەکی تایبەتی پۆلیس ئەکەونە دوای تەکسیەك کە نەفەرێکی تەمەن 29سالی هەلگرتووە بەناوی "مارك دووگان" . ئەوان بۆ ماوەی 45دەقیقە بەدوای تەکسیەکەوە ئەبن و ئینجا کە نەفەرەکە خەریکە نزیك بێتەوە لە گەڕەکەکەی هەلئەکوتنەسەری و ئەیکوژن. پۆلیس دەسبەجێ و زۆر بەملووڕی هەوالەکەی وا بلاوکردەوە کە ئەم کەسە چەکدار بوەو وویستوویەتی دەست بۆ چەکەکەی بەرێت و تەقە لە پۆلیس بکات بۆیە کوشتوویانە و هەقی خۆیانە. لەملاشەوە و لە بلاوبوونەوەی هەوالەکەدا کەس و کارو ناسیاوانی کوژراوەکە ووروژان و بە هەوالەکانی پۆلیس ڕازی نەبوون و چوونە سەر مەخفەری پۆلیسی ناوچەکە . نزیکەی دووسەد کەسێك لە دانیشتوانی گەڕەکەکەو ئەوانەی لە ڕوادەوەکە و لەکەسەکەوە نزیك بوون ئەچنە سەر پۆلیس خانەی ناوچەکە . پۆلیسی مەخفەرەکە هیچ وەلامێکی بۆ کەسووکاری کوژراوەکە پێ نەبوو ، جگە لە چاوەڕوانی کردن و ئیهانەو هەرەشەو هەولی دوورخستنەوەیان لە مەخفەرەکە . پالەپەستۆ لەسەر مەخفەرەکە تا دەهات زیاتر دەبوو . گەنجی ناوچەکەو ئەو گەنجانەی تریش کە پەیوەندیان بە گەنجی ناوچەکەوە هەبوو ووردە ووردە لەدەوری مەخفەرەکە کۆبوونەوە . هەوالی تر بلاّبووەوە کە پۆلیس درۆ ئەکات و ئەم کەسە بێ چەك بووە و ئەوان ڕایان کێشاوەتە دەرەوە لە تەکسیەکەو هەر بە ئارەزوو کوشتوویانە . ئەوەش دەرکەوت کە ئەشێت دەمێك بێت بە دوایەوە بووبن و مەبەستیان بووبێت

کە ئەم کارە بکەن. ئەمەش جۆرێکە لە تەعداکردن لە دانیشتوانی ناوچەکە، کە بەرچەلەك ئەفرۆ-کاریبین و لە ڕابردووشدا بەربەرەکانێی زۆریان لەگەڵ پۆلیسدا هەبووە و هەر ئەو ڕقەیە درێژ بۆتەوە بۆ ئەمڕۆ(1




Central London، March 26, 2011 the Ritz Hotel

---

(1)

مارك دووگان، بەگوێرەی ئەوانەی ئەیناسن ، باوکی چوار منداڵی گەنجە و کەسێکی بەڕێز و سادەی گەڕەکەکە بووە و هیچ مێژوویەکی تایبەتی وای نییە کە بیبات بەرەو ئەم کوشتنە ، بێجگە لەوەی کە لە بەشی گەڕەکێکا ئەژی کە مێژوویەکی زیندووی هەیە لە ڕاپەڕیندا و لە ساڵی 1985دا بەربەرەکانێیەکی قورس لە نێوان دانیشتوانی ئەم گەڕەکەدا ، کە زۆربەی خەڵکی ئەفەریقا و جامایکان، و لە نێوان پۆلیس دا ڕووی دا . ئەمە لە کاتێکدا بوو کە پۆلیس پەلاماری کەسانی دیاری کراوی گەڕەکەکەی داوە و یەکێك تیا چووە لەم پەلامارەی پۆلیس دا و پۆلیسێکیش کە لەپاچە کراوە بەدەست دانیشتوانەکەوە . لەو کاتەوە ، بەگوێرەی ووتەی ئێستای دانیشتوانی ئەو گەڕەکە ، پۆلیس لە هەراسان کردن و تۆڵەسەندنەوە لەوانە و لە نەوەی ئەوانەی بەشداربوون لەم بەربەرەکانێیەدا نەوەستاوە.



لە هەمان کاتدا لەم گێرمە و کێشەیەدا هەم پۆلیس ناچار بوو کە خۆی بە درۆ بخاتەوە و ئەوە ڕاگەیەنێت کە ڕاستە کوژراوەکە چەکدار نەبووە ، بەلآم ئێمە هەر کوشتوومانەوە و پێشتان نالێین بۆ چی . وە هەم جلەوی خۆپیشاندانەکە لە دەست کەس و کاری کوژراوەکە دەرچووە وە کەوتە دەست گەنجانی ناوچەکە . پۆلیسی مەخفەرەکە کەوتە پەلاماری کەسانی دەوری مەخفەرەکە و یەخەی یەکێك لە کچەکانیان دادڕی . بەیەکادان تەقیەوە و پەلاماری مەخفەرەکە و سەنگەرەکانی پۆلیس و کۆگا و دام و دەزگاکانی نزیك درا . جادەکان بوونە مەیدانی پەلاماردان و کۆنترۆل کران . دەزگاکانی ڕاگەیاندنن ترۆکران . هاتووچۆ کەوتە ژێر کۆنترۆلی ئەوانەی کە کۆنترۆلی جادەکانیان کرد




Mapping the riots in London August 2011

هەوالی تەشەنە سەندنی ئەم بەربەرەکانێیە بلآوئەبێتەوە بە ناوچەکانی تری لەندەن و بە شارە سەرەکیەکانی

وولآتدا . زیاتر و زیاتر کەسانی هاوشان وهاوبابەت دێنە ناو ئەم بزووتنەوەیەوەو لە جێگەی خۆیانەوە هەمان کردەوە دەنووێنن.

**پەلاماری پۆلیس و تالآن کردنی بازاڕەکان و شکاندنی دەزگاکانی ڕاگەیاندن و یاخی بوون لە هەموو گفتوگۆو وتووێژێکی سیاسی و ڕاوێژکردن ئەبێتە هێزی زال و لەهەموو لایەکەوە تەوژم ئەدا و پاشەکشە بە پۆلیس و میدیاو ڕاوێژکاری سیاسی و کۆمەلآیەتی ئەکات لەلایەك ، و ڕێکخراوە چەپ و ئەنارکیستە ڕەسمیەکان و ئایدیۆلۆجیای هارمۆنی کۆمەلآیەتی بێزار ئەکات و ئەیان کاتە تەماشاکەر لەلاکەی ترەوە**




August 2011

چوار ڕۆژی بەردەوام شەڕ بەردەوام بوو لەنێوان بەرەی پۆلیس و خاوەندارەکان و دەزگاکانی ڕاگەیاندن و نیشتمان پەروەرەکان لەلایەك ، وە ڕەش و ڕووت و یاخی بووەکان و ئەوانەی خۆیان بە هاوخەبات ئەبینی لەلایەکی ترەوە . بازاڕەکان تالآن کران ، پاس و سەیارەکان سوتێندران ، جادەکان کرانە سەنگەر و ئاگر بووبە هاندەری خەبات و لە هەموو لایەکەوە پاشەکشە بە پۆلیس کرا

**ئەم ڕقە قولە کۆمەلآیەتیە و نیشانەکانی پەلاماردانی : مولکیەت ، پارە ، بازاڕ ، پۆلیس ، میدیا ، نەقابی و سیاسیەکان ، لە مێژووی ناکۆکی کۆمەلآیەتی نێوان چەوساندنەوەی ژیان و دیکتاتۆریەتی بەهاوە سەرچاوەی گرتووە . خۆڕاپسکاندنێکی زیندووە بۆ ڕزگارکردنی ژیان لە دەست چەوساندنەوە و دیکتاتۆریەتی کالآ . بریتیە لە بووژانەوەی خەباتی چینایەتی لە ڕێگەی کرداری ڕاستەوخۆوە (دایرێکت ئەکشن) لە بەریتانیادا لە دژی پارلەمانتاریزم ، نەقابەچێتی ، دین و ڕەگەزپەرستی و کەلتورەکانی تری سۆشیال دیمۆکراتی . بریتیە لە لکاندنەوەی هاوبەرژەوەندی ئینتەرناسیونالیستی لە بەریتانیادا بە خەباتەکانی ئەمڕۆوە**






ئەمهاتنەسەرجادەوپەلاماردانە نادیمۆکرسانەی چەوساوەکان لە لەندەن و بلاوبوونەوەی پەلاماردان لەشارە سەرەکیەکانی وولآتدا لە کاتێکدا ڕووی دا کەڕاپۆرتە سیخوڕیەکان و چاودێریە نهێنیەکان وپەیامنێری دەزگا دیمۆکراسیەکان هیچیان وای بۆ نەچوون کە شتێکە بەڕێوەیەو چاوەڕوان کراوە ئەوانیەکگرتنی چەوساوەکانیان بەوئاستە چاوەڕوان نەئەکرد و بڕوایان وانەبوو کە هێزی شۆڕشگێڕی ژیان لە چەوساوەکاندا ئەو توانایەی هەیە کە دابەشبوونە فەردی و دینی و کەلتووری و ڕەگەزپەرستی و منافەسە ئابووریەکانی نێو چەوساوەکان لەم وولآتەدا بشکێنێت و هێزێکی پەلامادەر و ئاراستە دەر دژ بە دیکتاتۆریەتی ئابووری پێک بێنێت



A young law student from London talks about smashing up a car showroom and setting fire to a sports car



بۆیە بەم دلنیاییەوە ئەوکاتەی کە تەقینەوەکە ڕوویدا پاریزگاری لەندەن و سەرۆکی وەزیران و زۆربەی وەزیرەکان لە دەرەوەی وولآت لە سەما و سەیران بوون . پۆلیسی شارەکان توانای پاریزگاری کردنی هەموو دووکان و بازەڕەکانیان نەبوو . لە کردەوەدا ئامادەی شەڕێکی وا بەرفراوان نەبوون و سەریان لێ شێوابوو . وە لە زۆربەی شوێنە ئاژاوەییەکاندا ووردە بۆرجوازیەکان بەتایبەتی هندی و پاکستانی و ئیسلامیەکان دەستەکانی خۆیان پێك هێنا بۆ پاریزگاری کردن لە بازاڕەکانیان و مالەکانیان.



لەناو پەلاماردەرو تالآن کەرەکاندا نەك تەنیا ئەندامی زۆربەی گروپە سەرجادەییەکانی بەرامبەر بەیەك هێزیان کردبوو بەیەك وپێکەوە تالآن و پەلاماریان ئەدا ، بەلکو ماموستا و قوتابی ، گەنجان ویارمەتی دەر وڕاهێنەرەکانیان ، بوو بوونە هاوخەباتی یەکتری . ئەم هاوخەباتیە نمونەیەکی زیندووی گرنگە دژ بە دابەشبوونی کرێکاری ، دژ بە ڕێکخراوو بوونی ئیش ، دژ بە سیکتاریزمی نەقابی و دابەشبوونە دیمۆکراسی و پەرتەوازەییەکانی بازاڕ و دەولەت



وەلآمی دەولەت ئەوەبوو کە سووپا ئامادە بێت ، پۆلیس سەنتەری شارەکان کۆنترۆل کات ، وەزیرەکان و کۆمیتەی نهێنی کۆبنەوە ، پۆلیس لە شارۆچکەکانەوە بهێنرێت ، سیخوور و ڕۆژنامەنووس و فۆتۆگرافێکی زۆر بخرێنە سەرجادەکان بۆ

وویٚنه گرتن و ڕاپۆرت دان و چیرۆك هه‌لبه‌ستن به پێی پێویستی پۆلیس
سۆسۆلیجیسته‌كان بۆ ئه‌وه‌ی بواری ڕه‌خنه‌ی ڕیفۆرمیستی بكه‌نه‌وه و به‌زه‌یی و خێرخوازی بره‌وپێبده‌ن و توانای دژ به سه‌رمایه‌ی ئه‌م بزووتنه‌وه‌یه بكوژن ، دێن و ئه‌م جۆره پرسیارانه ئه‌كه‌ن كه ئایا
"داماووی و نه‌بوونی هۆی به‌رپابوونی ئه‌م ڕاپه‌ڕینه بوو؟
وه‌لآمه‌كه‌شیان ئه‌وه‌یه كه " مادام نه‌بوونی كاریگه‌ری هه‌یه له‌سه‌ر بواری ته‌ندرووستی و خوێندن و هه‌ستان به تاوان كردن ، بۆی هه‌ی هۆیه‌ك بێت له هۆیه‌كانی به‌رپابوونی ئه‌م ڕووداوه . بێ گومان ڕاپه‌ڕینه‌كان شتێكی ئالۆزن و شتی جۆراوجۆر ده‌وری تیا ئه‌بینن ، بۆنموونه به‌شێك له‌و كه‌سانه‌ی به‌شدار بوون له ڕاپه‌ڕینه‌كه‌دا كه‌سانێكیبوون كه ده‌رامه‌تیان باش بوو . به‌لآم له‌گه‌ل ئه‌وه‌شدا هه‌ق نیه فه‌قیری به دوور بزانین له هۆكاری ئه‌م ته‌قینه‌وه‌یه " . ه



**سیاسیه‌كانی هه‌موو پارته‌كان یه‌كیان گرت له نه‌عله‌ت كردن له‌م بزووتنه‌وه دژ به خاوه‌نداریتی و دیمۆكراسی یه**

هاوولآتیه لایه‌نگیره‌كانیشیان كه‌وتنه یارمه‌تی دانی پۆلیس و شارڕه‌وانیه‌كان بۆ به‌رپێگرتن و تێكشكاندنی ئه‌م ته‌وژمه تێكده‌ره  ئنجا پۆلیس كه‌وته په‌لاماردان و كوژانه‌وه‌ی ئاگره‌كان و ڕاوكردنی هه‌موو ئه‌وانه‌ی وێنه‌كانیان گیرابوون و یان سیخووره‌كان ده‌ستنیشانیان كردبوون . له‌ماوه‌ی یه‌ك هه‌فته‌دا زیاتر له سێ هه‌زار كه‌س ته‌نها له شاری له‌نده‌ندا ڕاپێچی دادگا و زینندانه‌كان كران . ده‌وله‌ت هه‌ر له‌سنووری دامركاندنه‌وه ی بزووتنه‌وه‌كه  و سزادانی ئه‌وانه‌ی به‌شداربوون تیایدا نه‌وه‌ستا . به‌لكو ئه‌و كه‌وته په‌لاماردانی باری ژیانی خاوو خێزانه‌كانیان ، بڕینی یارمه‌تیه‌كانی ده‌وله‌ت له دایك و باوكیان ، ده‌ركردنیان له خانووه‌كانی ده‌وله‌ت ، ده‌ركردنی كرێكاره‌كان له ئیشه‌كانیان ، هه‌تا ئه‌گه‌ر سووكه تالآنێكیشیان كردبێت ، ئینجا درێژكردنه‌وه‌ی سه‌ركوتكردن و چاودێری كردن بۆ قوتابخانه‌كان ، به‌تایبه‌تی سه‌ره‌تایی و ناوه‌ندیه‌كان ، وه داواكردن له ماموستا و مدیره‌كان كه ده‌ستنیشان و ڕاپۆرتی ئه‌وانه بكه‌ن كه سه‌ر به خێزانی گێره‌شێوێنن و هه‌ر له‌منالیه‌وه شكی ئه‌وه‌یان لێ ئه‌كرێت كه ببنه تێكده‌ر.  ئه‌م لایه‌نه له كۆنترۆل كردن و ده‌ستخستنه ناو ژیانی ڕۆژانه‌ی منداله‌كان و ، خێزانه‌كانیانه‌وه ، به به‌رده‌وام ئیشی له‌سه‌ر ئه‌كرێت و تا بێت به‌رفراوانتر ده‌بێت . بۆنموونه بابه‌ته‌ دینیه‌كان ،  بابه‌ته‌كانی به هاوولآتی بوون ، گرنگی دیمۆكراسیه‌ت و هه‌لبژاردن ،

نووسین لەسەر خێزان و ژیانی ماڵەوە ، بە بەردەوام تێکەڵاو بە وانەکانی فێربوون دەکرێت

ئەم شاڵاوەی دەوڵەت ا ژمارەیەکی زۆری گەنجەکانی خستە باری ژیانی نهێنی و خۆحەشاردانەوە ، کە ئەمە خۆی لە خۆیدا هەلو مەرجی خۆبەدەستەوەنەدان و بەردەوامی خەبات بۆ تەقینەوەکانی داهاتوو خۆش ئەکات
سییتەمی یاسایی زیاتر لە 2000 کەیسی تا ئێستا بەڕێ کردووە ، پۆلیس ئەدرێس و ووردەکاریەکانی لەسەر ناوچەکان تۆمارکردووە ، وە دەیڤد کامیرۆن ( سەرۆك وەزیران ) پلانەکانی بۆ چاودێری کردنی خێزانە گێرەشێوێنەکان لە "بەرتانیادا پێشکەش بە پارەمان کرد " . ە

ئەم تیژ کردنەوەو بەرفراوانکردنەی سەرکوتکردن شتێکی تازە نی و هەمیشە لەئارادا بووە ، چ بۆ بەرگرتن بەوەی کە پرۆلیتاریا خۆی ڕێکخات بو خەبات ، وەچ بۆ ئەوەی کە بیخاتەوە ژێر دەست لە دوای تێکشکاندنی هەستانەکەی .
ئەوەی گرنگە لێرەدا ئەوەیە کە ، دژی دیمۆکراسی خوازو ئاشتی پەروەرەکان ، **ئەوە ببینین کە چۆن هەموو دەوڵەتەکان ، بەهەموو جیاوازیە نیشتمانیەکانیانەوە ، هەتا بۆیان بکرێت نایانەوێت درێخی بکەن لەم هەلسووکەوتی سەرکوتکردنە سەرتاپاییە.** هەرلەبەر ئەم پارێزگاری کردنەیە لە سیستەمی چەوساندنەوە کە بۆنموونە بزووتنەوەی کرێکاری زیاتر لە دووسەد ساڵە لە م ووڵاتەدا هەیە کەچی کردەوە شۆڕشگێڕیەکانی بە پەنجەی دەست ئەبژێردرێن و سەندیکال و ڕێکخراوە دیمۆکراسیەکان دەستیان لە بینەقاقای ناوە . لە ژمارەپێنجی گۆڤاری کۆمۆنیزم بەکوردی ، کە لە مانگی چواری ساڵی 2011 دا. دەرمان کرد ، چەند نموونەیەکی زیندوومان لەسەر ئەم ناکۆکیەی بزووتنەوە کە لە بەریتانیادا نیشانداوە
لەگەل سەرکەوتنە دیاری کراوەکانی پەلاماردەرانی ناوچەکانی لەندەن ، بەسەر و لە دژی ڕێکخستنی کۆمەل و بوونی دەوڵەت ، لافاوی هاتنەسەرجادەکان و پەلاماردان بڵاو بووە بە چەندین شار و شارۆچکەی بەریتانیادا . ئەم تەووژمە شارەکانی مانچێستەر و بریستۆل و گلۆستەر و لیڤەرپوول و بێرمینگەهام یشی گرتەوە . بە زۆرو بەکەم هەمان پێویستی و کردەوە بووبە دروشم و هێزی پەلاماردەرەکان

د " دەست بەسەرەکانی زیندانی ئاوالە ڕاپەڕین و کۆت و بەندەکانی خۆبەدەستەوەدانی کڕین و فرۆشتنیان پچڕاند ، بەمەش خەوە ناخۆشەکانی ( نایت مێر ) سەرمایەدارای بەراستی بەرجەستە بووە . "
ئە م سیستەمە دابەش بووە بەسەر ئەوەی کە هەیەتی و ئەوەی کە نیەتی ، وە ئیشی دەوڵەت ئەوەیە کە برەو بەم دابەش بوونە بدات .
ئەگەر چینی ژێردەستەی ئەم سیستەمە بکەونە گیانی یەکتری و یەکتری بکوژن ئەوە هیچ کێشە نیەو شتێکی چاکە . بەڵام کە خۆیان گورج ئەکەنەوە بۆ بەرەنگاری بوونەی ئەم سیستەمە و بەوەی کە لە توانایاندایە پەلامار ئەدەن ، ئا لەویا ئەبنە کێشەو پۆلیس و سوپا لە ئارادایە بۆ زیندانی کردن و کوشتنیان" . (لە بڵاوکراوەی 325 یبی ئەنارکیەکانەوە ، ئۆکتۆبەری ، 2011 ، بە ئینگلیزی ، وەرگێراوە
**هەموو بەش و ڕێکخراوەکانی دەوڵەت ( پۆلیس ، میدیا ، سیاسیەتمەداران ، پیاوە دینیەکان ، هاووڵاتیان ، خانەدار و پایەدارەکان ) شپرزە بوو بوون و بە دلەڕاوکێ وە خەریکی دامرکاندنەوەی ئەم بزووتنەوەیە بوون و داوای تۆلەسەندنەوەی توونددو تیژیان ئەکرد بەرامبەر بە بەشداربووەکان . بەڵام هەرپەشە و گوورپەشەی سیاسیەکان ، نالەی خاوەندارەکان ، پرۆپاگەندەی دەزگاکانی ڕاگەیاندن ، تفوو نەعلەتی هاووڵاتیان و ئاشتی خوازان ، ناوناتۆرەی ئەمانە دز و جەردەو پیس و پۆخلەکان و سەر بەدەستەی ڕاووڕوت کەرەکان ، ئەمانە هەمووی بێ کەلك بوون لەوەی کە "گەنجەکان بووەستێنێت لەوەی کە بلکێن بە ڕاپەڕینەکەوە " و زەوقی لێ ببینن و شانازیشی پێوە بکەن. ئەخلاقی دینی و بەزەیی و شەرمەزاری و پیس و پۆخلی و ناوو ناتۆرە ، لەگەل ترس و لەرز لە سەرکوتکردن و تیرۆری دەوڵەت ، بوو بە ژێر پێیی هاوخەباتی و ووزەی ژیانی ڕاپەڕیوەکانەوە.**

نزیکەی سێ سـال بەسەر کوشتنی مارك دا تێپەڕیووە ، تائێستا پۆلیس هۆی ڕاستەوخۆی ئەم کوشتنەی ڕانەگەیانـدووە . پۆلیس ئەوە نادرکێنیت کە ئایا ئەم کەسە ڕەگەزێکی ترسناکی دژ بە دەولەت بووەو گەشتۆتە ئاستێك کە هەر ئەبێت لەناوببرێت؟ یان ئایا کوشتنی ئەم کەسە پلانی ئەنقەستی پۆلیس بوەوو بۆ تاقی کردنەوەی وەلآم دانەوەی دانیشتوانی ناوچەکە بووە؟ یان ئەك کردەوەیەی پۆلیس ڕاهێنانێکی نەتەوەیی و خۆنیشاندانی چەکداری و خوێناوی پۆلیس بووە بۆ چاووتۆقانـدن و ترسانـدنی هەموان؟ یان ئایا پۆلیس بەڕاستی هەلەی کرد و لەدەستی دەرچوو ، هیچ مەبەستی وورووژانـدن و تاقی کردنەوەو خۆنیشاندان نەبووە و کەرێتیەك بوو ڕوویـدا ؟ تا ئێستا هیچ کام لە سێ لایەنەکەی ئەم ڕووداوە وەلآمی هیچ لایەنێکی ئەم پرسارانەیان بە ئاشکرا نەداوەتەوە . نە کوژاوەکە شتێکی وای جێهێشتووە کە ئەمە ڕوون بکاتەوە . نە کەس وکار و هاووڕێیانی کوژراوەکە هیچیان لەسەر ئەمە نیشان داوە ، نە سایەق تەکسیەکە ناسراوەو دیارە و هیچی لەدەم دەرچووە . لەوەش ئەچێت پۆلیس سایەقەکەی بە تەواوی خسبێتە ژێر چاودێری و دەست بەسەریەوە . پۆلیسیش هەر لەسەرەتاوە درۆی کردووەو بابەتەکەی شاردۆتەوە . ئەم پرسیارانە تا ماوەیەکی زۆر دەوران ئەکات و ئەمێنێتەوە ، ناو بەناویش بەشێك لە وەلآمەکانی سەرهەل ئەدەن . تازەترین هەوالی پۆلیس ئەوەیە کە ئەم کەسە خەریکی چەککڕین بووە لە چەك کڕین گەڕاوەتەوەو ئەخباری لەسەر بووە کە چەکی پێیە بۆیە کوشتوویانە

**هێزی چینایەتی و ڕادیکالی ئەم ڕاپەڕینە لەوەدا بوو: و**

**یەکەم :** کە ئەم تەقینەوە کۆمەلآیەتیە لەلایەن ڕێکخراوە سیاسی و نەقابی و ژینگەگەری ڕاگەیانـدنەکانەوە بانگێشەی بۆ نەکرابو ، چاوەڕوان نەئەکرا و ڕێك نەخرابوو. لەبەرئەوە ئەم بزووتنەوەیە هەم یاخیبوونێك بوو لە کۆنترۆلی ئەم ڕێکخراوانە و لە داواکاریە ڕیفۆرمیستەکانیان ، وە هەم ناموش بوو پێیان. و

**دووەم:** داواکاریە سەرەتاییەکانی ئەم تەقینەوەیە لەدژی پەلاماری پۆلیس ، دژی کوشتن و چەسانـدنەوەو تەعـداو ژیانی مەمرەومەژی و نیمچە مردوو کە بالی بەسەر ژیانی ڕۆژانەی چەوساوەکانـدا کێشابوو. ئەو ڕێکخراوانە نەك هەر وەلآمیان نیە بۆ ئەم جۆرە کێشانە ، بەلکو وەکو دوکانی لاکۆلآن و ,ڕێکخراوە مافیاکان بەکاری دێنن و لەسەریشی ئەژین

**سێیەم** ، ڕاستەوخۆ پشت بەستنی هێزی کۆمەلآیەتی ئەم بزووتنەوەیە بەخۆی ، نەك بە ڕاوێژکار و ناوەندەکان. وە لەبری چاوەڕوانی ، کەوتە کرداری ڕاستەوخۆ و هەلی کوتایە سەر بنکەی پۆلیس و داوای وەلآمی دەست بەجێی بەرپرسیارانیانی کرد بەرامبەر بە پەلاماری پۆلیس. ئەمەش بوارێکی ئەوتۆی نەهێشتەوە بۆ ووتوویژوو گفتوو گۆ ، وە ئاگرەکەی بەبێ پەرژین لە شەقامەکانـدا بلآوکردەوە

**چوارەم** ، کەسانێکی زۆری ناو ئەم تەقینەوەیە ماوەیەکی زۆرە لەژێر پالەپەستۆی دەولەت و دەزگا جۆراوجۆرەکانیدان و لە ڕێکخستنی کۆمەلآیەتی ژیان بێزار بوون ، تەقینەوەکان لە بیرکردنەوەو ژیانی ڕۆژانەیانـدا ئەسووڕێتەوەو بۆ دەرفەتێك .ئەگەڕێت کە خۆی بنووێنێ

**پێنجەم** ، خۆپیشانـدان و مانگرتنە نەقابی و ئاشتی خوازوهاو وولآتی خوازەکانی چەنـدین سالی ڕابردوو لەم وولآتەدا ( بەرامبەربە شەڕ ، بەرامبەر بە باری ئابووری و بە تێکـدانی ژینگە ) وێنەیەکی ڕوونی وای کێشاوە لە ڕسوایی بۆ خۆپیشانـدەرەکان و هێز بۆ دەولەت و ڕێکخراوەکانی لە پرۆسیس و سەرئەنجامی هەموو ئەم خۆپیشان و مانگرتنانەدا ، کە ئەوەی تۆزی غیرەت و هێزی هەبێت نەك هەر بەشـدار نابێت لەم شانۆگەریەی زینـدە بەچال کردنی ژیانـدا ، بەلکو دژیشی

ئەوەستێتەوەو کردەوە ڕاستەوخۆکان ئەگرێتە بەر . ئەوەندە سەرو گوێلاکی شکاو ، شەقی پۆلیس ، دادگایی و جەزاو سجن ، دەستخەڕۆیی و پڕوپاگەندەی ڕێکخراوەکانمان بینی ، ئەمە نەك هەر فێری ئەوەی کردین کە تێکەلی ئەمانە نەبین و گالتەجاڕیەکەیان دووبارە نەکەینەوە ( بە سەری شکاوو ، قنی دڕاوو ، گیرفانی بەتالو ، چوونە لیستی ناونووسی پۆلیسەوە بەرەو مەمرەو مەژی ژیان نەگەڕێینەوە و قولتری نەکەینەوە ) بەلکو بیێنە دەرەوە لەم تابلۆیەو لەدەرەوەی و لەدژی ئەمانە خۆمان ڕێك خەین.

گێرەشێونی بەربلاوو دانەمرکایەوە . ئەوکەسانەی کە ترسیان شکا بوو ڕژانە سەر شەقامەکان ، خۆیان کۆکردەوە بۆپەلاماردان و بردنی ئەوەی کە پێیان ئەبرێت . پۆلیس واقی وڕما بووو وە بەزێنرا بە دەست ئەو گروپە بچووك بچووکانەوەی ، کە لەبری ئەوەی بکەونە چاوەڕوانی و بووەستن تا تێك ئەشکێن ، بەخێرایی پەلاماریان ئەداو لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر ئەچوون و تیرۆریان ئەخستە دلی ئەوانەوە کە لەدەرەوەی ئەم شەپۆلە بوون و ئەم جۆرە کردەوانەیان بەهی خۆیان نەدەزانی

( **325**، a radical publication in English , October 2011)

لەبەرهەموو ئەمانە ، ناڕەزای و پەلامارەکانی بەشداربووانی ئەم شەپۆلە ، زۆر قول و درندانەبوو بەرامبەر بە **دیکتاتۆریەتی ئابووری ، ڕێکخستنی چینایەتی کۆمەل ، کەلەکەبوونی کالآو خاوەنداریێتی . لەهەموو ئەم شەپۆلەدا کە نزیکەی هەفتەیەکی خایاند پەلامارەکانی پڕۆلیتاریاکان بۆسەر بازاڕەکان ، بانقەکان ، مەخزەنەکان و تێکدانی هاتووچۆی ناوشار بەڕوونی ئەوەی نیشاندا کەئەم بزووتنەوەیە دژی هێزی کەلەکەبوونی سەرمایەو بەرهەم و ڕێکخستنەکانیەتی . ئەو ئەیەوێت ئەم هێزە تێکبشکێنێت و لە ماددەکانی ژیانێکی کۆمەلآیەتی باشتر بۆ خۆی دروست بکات . ئەم بزووتنەوەیە ئەوەی نیشان نەداوە کە دژی کەس و ڕەمز و ئایدیۆلۆجیایەکە و بۆ خوێن ڕشتن هاتووە . ئەو تەنیا لەو کەسانەی داکە بەرگریان لە ڕێکخستنی کۆمەل کردووە . هەموو سیناریۆکانی پۆلیس و میدیا بۆ ئەوەی ئەوە نیشان بدەن کە ئەم بزووتنەوەیە تاوان و کوشتن و دەربەدەری خستۆتە ناو دانیشتوانی ناوچەکانەوە لە پەنجەی دەست تێ نەپەڕی و نەگەشت بەهیچ . نزیکەی سێ هەزار کەس تەنیا لە شاری لەندەندا گیراوە لەسەر ئەم بزووتنەوەیە ، لەو سێ هەزارە هیچی لەسەر کوشتن نەبووە ، بەلکو لەسەر تێکدانی کۆمەل و شکاندنی دیکتاتۆریەتی ئابووری و سیاسی سەرمایەدارەکان بووە .** " کۆمەلێ لە گەنجەکان ڕیزیان گرتووە لە بەردەم کۆگاکاکەشخەکاندا و ئەلێی مەعمیلی هەڕاجی دوای سەری سالن و زۆر لەسەر خۆ خۆیان ئەکەن بەو کۆگایانەدا و لەولاوە بە کیسەی زل زل و جاری واشە بە عەرەبانەی پڕە لە کەل و پەل یەنە دەرەوە و پۆلیسیش دەستەوەستان تەماشایان ئەکات" هەمان سەرچاوە

October 2011

ڕۆژنامەیەکی ڕۆژانەی ڕەسمی لە هەشت مانگ دوای ئەم بزووتنەوەیەدا ئەوەی بلآوکردەوە کە گەنجێکی تەمەن نۆزدە سالی دانیشتووی نۆتینگهام تاوانی ئەوەی بەسەرا دراکە وویستوویەتی پۆلیس خانەیەك بسووتێنێت "ت

( i newspaper, Tuesday 17 April 2012 )

ئەمانە پیمان دەلێت کە **دەولەت زنووقی لەم بزووتنەوەیە چووبوو لەبەر ئەوە نەبووکە خوێن ڕێژ بووە و قەسابخانەی نابۆوە لە ناوچەکاندا ، بەلکو لەبەرئەوەی تێکدەری ئاشتی کۆمەلآیەتیە ، وە لەگەل هەموو لاوازیەکانی دا ، بۆن و نموونەی دکتاتۆریەتی چینایەتی پڕۆلیتاریای لێ دێت . گەر بێت و تەشەنە بکات زیاتر ئەم سیمایە لەخۆ دەگرێت لەبەر ئەوە ئەبێت سەرکوت بکرێت.**

بەلای ژمارەیەکی زۆر لە ڕێکخراو و کەسە چەپ و ئەنارکی و بەناو شۆڕشگێڕەکانەوە ، ئەم جۆرە ڕاپەڕینانە گەنجە بێ ئیش و ڕەش و لانەواز و نەخوێنەوار و ناسیاسیەکان پێی هەلساوون . هوشیاریەکی چینایەتی و شۆڕشگێری سەرچاوەی

نەبووە وگرنگیەکی ئەوتۆی نی یە و هیچی واشی لێ نەکەوتۆتەوە . خاوەنی هیچ دروشمێکی سیاسی نەبووەو هیچ ئالآیەکیشی
بەرزنەکردۆتەوە . هیچ ڕێکخستنێکی سیاسی و نەقابی و ئەنارکی بەشدار نەبووە تیایدا و بەرنامەیەکی لەو جۆرانەشی
نەبووە
ئەوان ئەلێن ئەوە ڕاستە کە ئەم تەقینەوانە لە تەسك بوونەوەی باری ژیانی ڕەش و ڕووتەکانەوە سەرچاوەی گرتووە ، بەلآم
کردەوەو ئوسلوب و وەسیلەکانیان ناشیرینەوە . بەشدار بووەکان سیاسەت مەدار و دبلۆماسی و هۆشیار
و ڕێکخراو نین
بە کوورتی لە ڕووی چینایەتیەوە ئەوەی ئەم کەس و ڕێکخراوانە ئەیلێن ئەوەیە کە ئەم بزووتنەوانە لە دیمۆکراسیەت لای داوە ،
هەڕەشە لە ئیش و خاوەنداریێتی و ڕێکخرابوونی کۆمەل ئەکات ، بازاڕی سیاسی هەلبژاردن و نەقەباگەری و میدیا و گفتوو
گۆی خستۆتە لاوە و تف لە پێکهاتەکانی ( ئینستووتوشین ) دەولەت ئەکات . لە ڕاستیشدا هێزە چینایەتی وو
ترسناکەکەی هەر لێرەدایە ، نەك لەوەی کە چەندین فەرهوودی کردووە و چەند زەرەری لە بازاڕەکان داوە

لە ڕاستیدا گەر سەرنجی پرۆسیسی ئەم بەیەکدانە بدەین ئەبینین کە نە دەولەت و نە پرۆلیتاری ڕاپەڕیوویش شتێکی
جیاوازیان لە کردەوەدا نەکردووە لە دەرەوەی ئەو بەربەرەکانیە کۆمەلآیەتیەی کە هەمیشە لە نیوانیاندا
بووە ، وە ناو بە ناو ئەچێتە ئاستی تەقینەکانەوە . بە دەر لە وبیرکردنەوەو هەولە زیندووانەی ژیان کە بە بەردەوام لە خەوو
خەیال و ژیانی چەوساوەکاندا ئەژی و ئەیەوێت ببێتە واقیێکی زال . مەمرەو مەژیە مێژووی و ڕۆژانەییەکانی سیستەمی
چەوساندنەوە و هەولە زیندووەکانی ژیان بۆ دەرباز بوون لە و مەمرەومەژیانە یە کە تەقینەوەکانی خولقاندووە .
کەلەکەبوونی ناڕەزایە تیە کۆمەلآیەتیەکانی چەوساوەکان و ڕەخنە کۆمەلآیەتیەکانیانە لە سیستەمی چەوساندنەو کە
بووە بە تەقینەوەو هەر جارەی بەهۆیەکەوە و لە سوچیکەوە سەرهەل ئەدات

گەر لە ڕووی هێزی دیکتاتۆریەتی بەها و دەولەتەوە سەیری کۆمەل بکەین ئەبینین کە سالآنە دەیەها کەس بە دەستی پۆلیس
ئەکوژرێت ، هەزارەها ڕاوانەی دادگا و نەخۆش خانە نەفسیەکان و زیندانەکان ئەکرێت ، سەدەها ئەکەوێتە بەر
هەڕەشەی برسێتی و بێ جێگەیی و دەربەدەری و لانەوازەیی . ئەمە لە کاتێکدا کە بازاڕەکان تا بێت زیاتر پڕ ئەبن لە شتی و
مەك ژمارەیان زیاتر ئەبێت ، کە خانووەکان زیاتر ئەچن بە ئاسماندا و سەرمایە زیاتر لە بانکەکاندا کەلەکە
ئەبێت ، کە دەولەمەندەکان زیاتر دەولەمەند ئەبن
و برەو بە سەیران و سەمای خۆیان ئەدەن و مندالەکانیان ڕەوانەی دانیشگا بەرزەکان ئەکەن ، کە گرانی تا بێت
زیاد دەکات و چەوساندنەوە پەرە ئەسێنێت و خەست ئەبێتەوە ، کە کارەساتەکانی ڕۆژانە تەشەنە ئەکات و قازانج
تا بێت بەرز ئەبێتەوە ، کە داەم و دەزگاکانی دەولەت سەرگەرمی پەرەپێدان و بەرگری کردنن لەم دیکتاتۆریەتەی سەرمایە .
ئەمە هەمووی دژی ناوەڕۆك و سیما مرۆییەکانی ژیانە . ئەم ناکۆکیە کۆمەلآیەتیەی ژیانە تەقینەوەکانی خولقاندوە و
ناشوەستێت لە تەقینەوە هەتا لە بووندا بێتو نەیخات بە لایەکدا

کێ بوون ئەوانەی کە بەشداری ئەم تەقینەوە کۆمەلآیەتیەیان ، دژ بە دیکتاتۆریەتی ئابووری و زۆرە ملێی داموو دەزگانی دەولەت ،
کرد ؟
بە پێی سەرجەم لە لێکۆلینەوەکانی دوای ئەم تەقینەوەیە و لە زمانی بەشداربووان و بە پێی ئەوانەی کە گیران و ڕاپێچی دادگا
تایبەتیەکان و زیندانی کردن کران لە سەرتاپایدا گەنجانێکی سەر بە زۆربەی خێزانەکانی نیشتەجێی ناوچەکانی
تەقینەوەکان بوون و لە ڕووی تەمەن و ڕەگەز و جنس و شێوەو شکلدا بە تەواوی تێکەل بو و . ئیش کەر و بێ ئیش ، کچ و کوڕ ،
قوتابی و نەخوێندەوار ، ماموستا و ئەندازیار و تەنانەت ئەوانەشی کە ئیشیان لە بنکە کۆمەلآیەتیەکاندا ڕاهێنانی
گەنجەکان بوو بە پێی پرۆگرامی دەولەت لە کاتی ئاشتی کۆمەلآیەتی دا پێکەوە لە پال ئەوانەی کە خەریکی ڕاهێنانیان بوون ،

شان بەشان پەلاماریان ئەدا و بازاڕەکانیان تالآن ئەکرد و خەریکی بلآوکردنەوەی ڕتپەڕین بوون. ئەوەی دوور بوو لەم ڕاپەڕینەوە زۆربەی ئەو کرێکار و قوتابی و هاولآتیانە بوو کە ئەندامی ڕێکخراوە نەقابیەکان و پارتە ڕەسمی و نیمچە ڕەسمیەکان بوون. ئەوانە بوون کە هێزیان خستبووە سەر هێزی بۆرجوازیەکان لە هەلبژاردن و نەقابەچێتی و بەهێزکردنی ئیش و دەولەتدا و چاوەڕێی ئەوەبوون کە لەم ڕێگەیەوە کێشەکانی ژیان چارەسەر بکرێت. هەروەها ئەوانەشی کە بە کەنیسە و مزگەوتو خاوەنداریێتی بازاڕەکانەوە گرێ درابوون و ژیانیان سووابوو لەوپەیوەنیەدا

لە خۆشبەختیدا ئەم خۆڕاپسکاندنەی پرۆلیتاریا دژ بە چەوساندنەوە و لە پێناوی ژیاندا زۆربەی ئەوانەی گرتەوە کە هێزێکی سەربزێویان تیا بووە ویلی ژیانێکی باشتر بوون. ئەوانەی کەنەك هەر بڕوایان بە هەلبژاردن و دام و دەزگاکان و نەقابەو حیزبەکان و کەنیسەو مزگەوت نەبوو بەلکو نەعلەتیشیان لێ ئەکردن وەك وەسیلەی دەولەت و هێزی ڕێکخستنی چەوساندنەوە

ئەم گێژەلووکەیەی تالآن و سوتاندن و تێکدانی دیکتاتۆریەتی ئابووری نموونەیەکی تایبەتنی یەو لە نەبەبوونیشەوە نەهاتووە. زۆربەی لایەنەکانی ئەم دژایەتیە لە ژیانیی کۆمەلآیەتی ئەو کەسانەدا هەبووە کە بەشداربوون تیایداو بە پەرش و بلآویی و نیمچە کۆمەکیش نا و بەناوە خۆی نیشان داوە. بۆ نموونە بلآوبونەوەی دزی دژی بەرسێتی کۆمەلآیەتی، پەلاماردانی بازاڕەکان لە هەچفرسەتێکدا هەلکەوتبێت، بلاووبوونەوەی سیستەکی کامێراو حەراسەت بۆ پارێزگاری کردنی بازاڕەکان و کۆمپانیەکان. بێ ووچان مڕاقەبەکردن و هاتووچۆی پۆلیس و پشکنیسن و گرتن و دادگایی کردن، هەروەها چەندین جاریاخی بوونی زیندانەکان و ئاگربەردانە ئۆردووگا و زیندانەکان لە چەند سالای رابردوودا. ئەمانە، بە پاك و پیسیانەوە، بەرهەم و هۆشیاریەکە کە ناکۆکی دیکتاتۆریەتی سەرمایە بە ژیانی مرۆڤایەتی خولقاندوویەتی و تابێتیش پەرە ئەسێنێت

کاتێك پرۆلیتاریاکان بە کۆمەل برسیانە، کرێکەیان فریای کرێ خانوو ئاووکارەبا، بەنزینی و فیتەرسەیارە و پێویستیەکانی تری مەمرەو مەژی ژیان ناکات، یان لەهەڕەشەی ئەوەدان کە بە تەواووی بێ کرێ ببن و بکەونە سەر جادە، تەنیا چەند ڕێگایەك لە ئارادایە : یان هەول بە زیاتر ئیش بکە، ئیشی تر بدۆزەرەوە، قەرز لە بانق بکە، داوای یارمەتی دەولەت و کەنیسە بکە یان بڕۆ دزی بکە، یان هەموویان بەیەکە بکە و ئینجا بەشیش نەکات. ئەویارمەتیەی کە دەولەت ئەیدات بە خێزانە کرێکاریەکاکان، بە باوەنەی کە بەدوای ئیش دا ئەگەرێن، بە قوتابیەکان . . . بۆ ئەوەیە کە کرێکار ئامادە بکات بۆ ئیش، مندالەکان بەردەوام بن لە خوێندن و ڕاهێنان، خێزان خۆی ڕاگرێت و دایك و باوکەکان بتوانن بجوولێن و ئەرکە کۆمەلآیەتیەکان بەجێ بێنن. ئابووری بەردەوام بێت لە بالڕاکێشان. ئەمە نەك هەر ئاستێکی هەرە نزمی لەمەمرەو مەژی داوە بە کرێکاران و خێزانەکانیان، بەلکو لەگەل بەرز و نزمی باری ئابووری دا و پیاچیۆونەوەکانی حکومەتدا هەمیشە لە گۆڕاندایە و ژیانی کرێکاران ڕائەچلەکێنێ. شەڕفرۆشتنی بەردەوامی دام و دەزگاکانی دەولەت بەم کرێکارانە لەگەل هەموو گۆڕانکاریەکی ئابووری و سیاسی دا، بەوەی کە پارەکانیان کەم ئەکەنەوە، ئیشی سوغرەیان پێ ئەکەن، ڕەوانەی ئیشی نیوە قیمەتیان ئەکەن، و ئەیاندنە دەست کۆمپانیا تایبەتەکان بۆ ئەوەی بە هەرشێوەیەك پێویستیانە هەلیان سووڕێنن

ئەم گێژەلووکە کۆمەلآیەتیە خۆڕاپسکاندنی چەوساوە سەربزێوەکان بوو لە دژی ئەم دیمۆکراسیەتەی ژیانی ڕۆژانە.ئەمە لە سەرەتادا سەربزێوەکانی ناوچەی تۆتنهامی شاری لەندەن و دواتر ناوچەکانی تری لەندەن و شارەکانی تری وولآت. لەبەر ئەوەی کە سەرچاوەی هاوبەشی ئەم گێژەلووکەیە بێزاری و نەویستی چەوسەوەکان بوو بەرامبەر بە بیرەوەری و ئەمڕۆی ژیانی چەوساندنەوە، نەعلەت کردن بوو لە زوولم و زۆری ئەم ژیانە، وە گەڕان بوو بەدوای ژیانێکی مرۆیی وادا کە ئەم

دیاردانەی تیانەبێت ، لەبەر ئەمە ئەم بزووتنەوەیە چاپتەرێکی تر بوو لە بزووتنەوەی دەستەکانی پڕۆلیتاریا دژی سیستەمی کاری کرێ گرتە .دژی بوونی مرۆڤەکان بە کالاّ و بوونی کالاّ بە ژیان .دژی کڕین و فرۆشت ، دژی کەلەکەبوونی پارەو شت و مەك ، دژی چەوساندنەوەو گرانی و هیلاکی بەردەوامی ژیانی ڕڕژانەو نەبوونی لەزەت لەژیان ، دژی شەڕ و دیکتاتۆریەتی ئابووری سیاسی و دەولەت .ئەمە شتێکی نە شازەو نە تازەشە لەمێژووی ململانێی چینایەتی دا.هەمان پێویستی و ووزەیە کە ملوێنەما لە پڕۆلیتاریاکانی لە تونس و میسرو تورکیا ویۆنان و بەڕازیل و فەرەنسا وئەمەریکاو چین و ... هێناوەتە سەر جادەکان و خستۆتە سەنگەرەوە دژی سەرمایەی جیهانی و ڕێکخراوەکانی.

لەبەر ئەمە گەڕان بەدوای ئەوەی کە چۆن و لە کوێوە ئەم گێژەلووکەیە سەری هەلدا؟ چۆن ئەبێت شتی وا ڕوبدات لە وولآتێکدا کە مێژووی درێژی هەیە لە هەلبژاردندا و خەریکی دامرکاندنەوەی ئەم جۆرە بزووتنەوەنەیە لەسەر ئاستی جیهانی ؟کە هەزارەها ڕێکخراوو پڕۆگرامی سیاسی و زانکۆیی و ئاسایشی داڕشتووە بۆ بەرگرتن بەم جۆرە گێژەلووکانە ؟ جۆرە گەڕانێکن کە ئەوە نابینن کە سەرمایە و دەولەت چی لەژیانی ڕۆژانەی مرۆڤەکان کردووە و چۆن هەلیان ئەسووڕێنێت ووزەو سەرچاوەکانی ژیانیان لێ زەوت ئەکات و پێیان ئەفرۆشێتەوە و لە مرۆڤایەتیان ئەکات.

دیسانەوە گەڕان بە شێوەیەکی سۆسیۆلۆجی بەدوای ئەوەی کە چەند ڕەش و چەند سپی ، چەند ئیش کەر و چەند بێ ئیش ، چەند ژن و چەند پیاو ، چەند قوتابی و چەند نەخوێنەوار ، هاووبەش بوون لەم بزوونەوەیەدا ، تەنیا بەشێکە لە قۆستنەوەی ئەم بزووتنەوەیەی ژیان و خزمەت کردنێکە بە بەرنامە زانکۆیی و سیاسی و ئاسایشیەکانی دەولەت.

**با دیسانەوە ئەوە بلێینەوە کە : هێزی ڕاستەقینەی ئەم بزووتنەوەیە لەوەدابوو کە پەلاماری خاوەنداریێتی تایبەتی و ڕێکخرابوونی دیمۆکراتیانەی کۆمەلی دا ، و ئابووری و سیاسەت و ئیعلام و دین و زانکۆکانی لەیەکتری جیانەکردەوەو هەموویانی بەدوژمنی ژیان ئەبینی . هیچ ئایدیۆلۆجیەتێکی نەکردبووە پڕۆگرامی خۆیی و هیچ ڕێکخراوێکی ڕەسمی و نیمچە ڕەسمی و مافیایی بەڕێوەی نە ئەبرد .هیچ هێزێکی نەقابی و سیاسی و کەلتووری دینی بانگێشەی بۆ نەکردبوو و وە دەوری تیادا نەبوو.بواری ووتوووێژ و دەمە تەقێ و ریفۆرمی تاسانبوو.پۆلیسی هێنا بووە سەرچۆك و کربوویە تەماشاکەری پەلاماردانەکان.لە ڕاستیدا لەبەر ئەوەی دەست بەسەراگرتن و فەرهوود و سووتاندن و تێکدان و گوفتوو گۆ نەکردن وەسیلەی ئەم گێژەلوکەیە بوو وە تیرۆری پڕۆلیتاریا لە دەرگای خاوەن دار و بانك و دوکان و هێزی ڕێکخراووی دەولەتی ئەدا ، لەبەر ئەمانە هیچ ڕێکخراوێك نەیئەویست لەم بزووتنەوەیە نزیك بێتەوە . تەنانەت ئەنارکیست و مارکسیست و سۆشیالیستەکانیش یان خۆیان لێ دوور ئەخستەوە ، یان دەوری هاوولآتیان لە پاکردنەوەی جادەکاندا ئەبینی ، وەیان خەریکی لێکۆلینەوە و نووسینی زانکۆیی بوون لەسەری بۆ ڕوونکردنەوەی دیاردەکە بۆ هاووولآتیان**

هەروەها ئەوە بوو کە توانی خۆی دەرباز کات لەو لاوازیانەی کە چەندین سالە بزووتنەوەی پڕۆلیتاریا لەم وولآتەدا تیایا ئەخولێتەوەو دەولەت لەسەری ئەژی. بەتایبەتی ژێر پێخستنی دەوری نەقابەکان ، ڕۆلی پارلەمان خوازان ، شەڕی دینی و ڕەگەز پەرستی ، ڕۆلی ڕێکخراوە ڕەسمیەکان ، مافیاکان ، دەزگاکانی ڕاگەیاندن ، ئایدیۆلۆجیای ڕەمزوو ژینگە پەرستی ، کۆبوونەوە و هاوارهاواری بێ ماناو بێ کردەوە و پاڕانەوە لەبەردەم دەولەتدا ، ئیجازەوەرگرتن بۆ خۆپیشاندان ، هەلگرتنی درووشمە حازکراوەکان ، بەدەستەوەدانی کەمایەتیە تێکۆشەرەکان بۆ پیلانەکانی پۆلیس ، گەڕانەوە بۆ مالەوە بە سەری شکماوو قنی دڕاواوو گیرهانی خالیەوە ، بچێنە ناو جادەو مەخزەن و بەردەمی بانقەکان بەبێ ئەوەی دەست بۆ هیچ بەرن ، یان خەریکی شکاندنی ڕەمزەکان بن ( لە ژمارەی پێشووی گۆڤاری کۆمۆنیزمدا ئەم لایەنەمان بەباشی نیشانداوە ) . بەلێ بزووتنەوەکە توانی لەم لاوازیانە تێپەڕێت بۆیە توانی چۆك بە بۆرجوازیەکان دابات. توانی ئەم بازاڕەی ئەمەلگام کردن تێك بدات و بواری خەباتی ڕاستەوخۆ بکاتەوە بۆ هەمووان. بەشێوەیەك کە بەینی نێوان

دەستەو ڕەگەزە کارامەکان و جەماوەری هەلمەت بەر زۆر نەبوو. دەستە بچووکە بچووکەکان ئەسووڕانەوە بۆ دیاری کردنی ئەو شوێنانەوی کە چاکە پەلامار بدرێت و خەریکی بلاوکردنەوەی شالاوەکان بوون، جەماوەریش بەدوایدا ئیشەکەیان تەواو ئەکرد. ئەوەی بۆیان بکرایە ئەیان برد ، ترس لە پۆلیس نەما بوو، پۆلیس بە پێچەوانەی جارانەوە ، لە بەرگری و پاشەکشە و چاوشاکێکردندا بوو لەگەل پەلامارەدەرەکاندا

وەکو هەموو جارەکانی پێشوو، پۆلیس لەسەرەتادا ئەم گێژەلووکەیەی بە سووکی وەرگرت و بە پەلاماردانێکی وای بینی کە زۆر ناخایانێت دا ئەمرکێتەوە و پۆلیس ئەتونێت لە بەرژەوەندبی خۆیدا بەکار ب بێنێ. چۆن؟ یەکەم، بۆ هێنانەدەرەوەی ئەو پالەپەستۆیەی کە لە ژیانی کەسەکاندا پەنگی خواردۆتەوەو دیاری کردنی توانا و ئاستە کۆمەلایەتیەکەی. دووەم ، دیاری کردنی ڕەگەز و دەستە ڕێکخراوەکانی و دەرکەوتنی بۆ پۆلیس. سێیەم، بۆ تەدریب پێکردن و تاقی کردنەوەی تواناکانی پۆلیس و بەرەودان بە تاکتیك و لیکۆلینەوەکانیان. چوارەم، بۆ تۆقاندنی لخاوەندارەکان و ڕاکێشانی نفووسی هاوولاتیان بۆ گرنگی بوونی پۆلیس و بەرزکردنەوەی دەرامەتی هێزەکانی پۆلیس .گەر ترس و لەرزی هاوولاتیان کەم بێتەوە پارەی پۆلیسیش دا ئەبەزێت. پۆلیس سەرێکی ئیشەکانی بە هاوولاتیانەو خاوەناریەتەکانیان و یاسا و دەستووەرەکانیەوە بەستراوەتەوەو سەرێکی تریشی بە مافیا و چەتەکانەو و ڕاووڕوتی ڕۆژانەوە و یاری کردن بە تەنگەبەریەکانی ژیانەوە بەستراوەتەوە

بەلام ئەمجارەیان پۆلیس بە هەلەداچووبوو وە بزووتنەوەکە بێ ئەوەی پۆلیس بەخۆی بزانێت ئەم پلانەی ژێر پێ خستبوو. هێزی مرۆیی بەشداربووەکان پۆلیس و دەزگاکانی حکومەت و پارتە سیاسیەکان و پارێزگاری شارەکانی لە خەو و سەیراکانیان ڕاچلەکاند. پۆلیس لە هەموو وولاتەکەدا کەوتە حالەتی ئینزارەوەو ڕەوانەی ناوچە ڕاپەڕیوەکان کران. بەشێك لە بۆرجوازیەکان لەوە ئەترسان کە پۆلیس توانای بەرگرتنی بەم ڕاپەڕینە نەبێت و داوای هاتنە ناوەی سوپایان ئەکرد. بەشێکی تریان مەفرەزەی تایبەتی خۆیانیان پێك هێنا بۆ پارێزگاری کردن. هەروەکو تونس و میسرو تورکیا و بەرازیل ، پۆلیس لەسەر لێواری ترازان وەستا بوو. دەولەت و خاوەندارەکان زنووقیان لە پەرەسەندی ئەم ڕاپەڕینە کۆمەلایەتیە چووبوو، بەتایبەتی کاتێك کەئەیان بینی، هەروەکو قارچك، هەر سەعاتەی لە سووچێکەوە و لە شارێکی ترەوە خۆی ئەنواند . بەپێی هەواڵە رەسمیەکان خۆیان، زیاتر لە سی تا چل هەزار کەس تەنیا لە شساری لەندەندا بەشدار بوون لەم بزووتنەوەیەدا.

کە بزووتنەوەکە خاووی کردەوە ، بەشەکانی دەولەت توانیان تاووتووێ و ڕاوێژی خۆیان بکەن، پۆلیس لە وناوچانەوە هێنران کە تەقینەوەی تیا نەبوو، ئینجا پەلاماری پۆلیس دەستی پێ کرد. ووێنەی ڕاپەڕیوەکان کۆکرانەو و گرتنی بەلێشاوو دەستی پێکرد. تەنیا لەشاری لەندەندا سێ هەزار کەس گیران و بە پەلە دادگایی کران. ئەو خێزانانەی کە لەسەر یارمەتی دەولەت بوون و مندالەکانیان بەشداربوون لەم ڕاپەڕینەدا کەوتنە بەر شالاوی دەولەت .گرتن و برسی کردنی جەماعی و دەربەدەری خێزانی کرایە چەکێکی سەرکوتکردن و تێکشکاندن. ئێستا پۆلیسە کە بە دەمووچاووی داشاردراوەوە و بە مەفرەزە ئەدەن بەسەر مالەکانداو کەسەکان ڕاپێچی دادگا تایبەتەکان ئەکەن

لە گەل ئەوەی کە دەولەت بەشێوەیەکی نموونەیی کەوتە تۆلەسەندنەوە لە هەموو ئەوانەی کە بۆنی خەباتیان لێ دێت. حوکمی زینندانی کردنی قورس قورس بەسەر ئەوانەدا کە بە بەلگەوە گیرابوون. بڕینی یارمەتیەکانی دەولەت لە خێزان و کەس و کاریان. درێژکردنەوەی چاودێری و کۆنترۆل کردن بۆ سەر هەموو ئەو خێزانانەی کە دەستیان لەم بزووتنەوەیەدا هەبوو. بڕیار ناردن بۆ هەموو قوتابخانەو بنکەی لاوان و دژام و دەزگاکانی خێزانی کە ئەبێت بەرنامەکانیان وا داڕێژن کە بتوتنێت دەستنیشانی ئەو مندالانە هەر لە زووەوە بکرێت کە بۆنی یاخی بوونیان لێ دێت. ئەبێت وانەکان و نووسینەکانی مندالەکان ئەوەی لە توانادا بێت کە هەموو لایەنەکانی ژیانی مندالەکان دەرخات. وانەکانی بوون بە هاوولاتی هەر لە زووەوە

بچەسپێنرێ . لەگەڵ هەموو ئەم توونـدو تیـژی سەرکوت کردنەشـدا خۆڕاپسکانـدنەکانی پڕۆلیتاریا لە چەوسانـدنەوە و بۆ ژیانی مرۆیی نەك هەر جوولاوە لەم وولآتەدا ، بەلکو ئاستەکەشی بەرز بۆتەوەو بیرکردنەوەو کردەوەکانی زیاتر بەرەو رادیکاڵ بوونەوە بردووە . دەستەو تاقمی بچووك بچووکی بەرهەمهێناوە کە بەیادی ئەو گێژەلووکەیەوە ئەژین و بیر لە هێزوو ڕوداوەکای ئەکەنەوەو

هەروەها دەرگای خستۆتە سەر پشت بۆ جەماوەری پڕۆلیتاریا کە خۆیان لە ڕێکخراوە ڕەسمی و ناڕەسمیەکان ڕاپسکێنن و نەعلەت لە هەلبژاردن بکەن و کردەوە شۆڕشگێڕیەکان بگرنە بەر

هەروەها ئیشی ئەم ڕێکخراوانەی قورس کدووە لەوەی کە بتوان بە پڕۆگرامەکانیان ئەم جەماوەرە بەدوای خۆیانـدا ڕاکێشن : بۆ بەردەم سنـدووقەکانی دەنگدان، بۆ تیرۆریستی دەولەت ، بۆ خۆراکی دەزگاکانی ڕاگەیانـدن، بۆ جەنگە ئیمپریالیستیەکان

بە کورتی ئەم خۆڕاپسکانـدنەی پڕۆلیتاریاکان لەم وولآتەدا ، ناکۆکی نێوان بەرژەوەنـدیەکانی چینی پڕۆلیتاریا و چینی بۆرجوازیەتی زەق کردەوە . ئەو گوژمی دا بە وویستەکانی پڕۆلیتاریا بۆ ژیان، وە یەکی گرتەوە لەگەل وویست و خەباتەکانی تری پڕۆلیتاریا لەسەر ئاستی ئینتەرناسیونالیستی
دیکتاتۆریەتی کۆمەلآیەتی پڕۆلیتاریا پەلاماری دیکتاتۆریەتی بەهای سەرمایەداری داو، بۆ چەنـد ساتێك و لە چەنـد ناوچەیەکدا هێنایە سەر چۆك و ئالآی ژیانی لەسەریەوە هەلکرد

ك " کوشتنی مارك دووگانیارمەتی دەربوو لە بـلآووبوونەوەی ئەو ڕاپەڕینە کۆمەلآیەتیە گەورەیەی کە نموونەی کەمە لە چەنـد دەسالی ڕابردووی بەریتانیادا ، وە هەر جارێکی تریش هەل ئەداتەوە " ە
ش " شەووی شەممەی شەشی ئۆغەست ، دوو ڕۆژ دوای کوشتنەکە ، لە ناوچەی تۆتینهامی شاری لەنـدەن، پۆلیس ، خانەکە پەلاماردرا ، سەیارەکانی پۆلیس سووتێنران، پاسێکی دووقات دووکەلی ئەچوو بە ئاسمانا ، وێنەگرەکانی دەزگاکانی ڕاگەیانـدن دارکاری کران و ئەوەی پێیان بوو زەووتکرا ، پەنجەرەکانی بانقێك ووردوو خاش کرا ، بازاڕەکان تالآن کران، گەنجەکان دەستیان گرت بەسەر کاگدۆنالـدا و دەستیانکرد بە سوورکردنەوەی گۆشت و پەتاتە " .ە

خۆش بەختانە ، هەروەکو بەشاکرا ئەبینرێت، ئەم وورووژانە کۆمەلآیەتیە ئەوەنەبوو کە :ە
لە لایەن ڕێکخراوێکەوە ، یان کۆمەلە ڕێکخراوێکەوە ، بانگێشەی بۆ کرابێت و ئاراستە کرابێت. کۆمەلە داواکاریەکی ئابووری، سیاسی ، ژینگەیی ، یان کەلتووری تایبەتی هەبێت. داوای مۆلەتی لە پۆلیس وەرگرتبێت کە بۆکوێ بچێ و چی بکاو چی نەکات
هیچ دابەش بوون و مۆرکێکی پیشەیی ، لائایـدیۆلۆجی ، ڕەگەزی ، نەقابی و سیاسی پێوە بێت
دەستەیەك لە پڕۆلیتاریا پەلاماری دەستەیەکی تر بـدات بە هەر بیانوویەکەوە بێت بۆ بەرژەوەنـدی سەروەرەکانیان سەر بە ململانێی هەلبژاردن و کێشمە کێشمی نێوان ڕاست و چەپ بێت

بەلکو ئەوەبوو کە :ە
ئەو بێزاری و بەربەرەکانێ و ڕق و تووڕەیی لە ژیانی چەوسانـدنەوەی چینایەتی ، کەچەنـدین سالە ئەکولێت، کلپەی گرت و بـلآو بووە بە شارەکادا
هەموو بەشـداربووەکان بەیەك کردەوەو بەیەك زمان پەلاماریان ئەداو ئەوپەیوەنـدیە چینایەتیەیان تێك ئەشکانـد کە

دەستیان پیادا ئەگەیشت ( کرێکاری ، خاوەنداریێتی ، سەرمایەو دەولەت )ە
ئەم تەقینەوەیە لەوە زیاتر بڕی نەکرد چوونکە :ە
زۆربەی کرێکارانی شارەکان قاچیان لەئیش و لە نەقابەگەری و دیمۆکرۆاسیەتدا چەقیبوو وە بە دوودلەیەوە ئەیان ڕوانیە
ئەم بزووتنەوەیە
دیمۆکراسیەت و دەولەت و خۆ بە هاوولآتی زان زالە لە ژیانی ڕۆژانەی زۆربەی کرێکاراندا و بۆتە فلتەر و تێکدەری
بیرکردنەوەو ڕێکخستن و پەرپرچدانەوە کرکێکاریەکان
چەندین هەزار ڕێکخراوو یاساو دەستوورو موناسەبات و تایبەتمەندی کرێکاری و ناوچەبی و کەلتووری لە
ئارادایە بۆ هێشتنەوەی کرێکاران لە شوێنی خۆیان و دابەش کردنی کردنی توورەبی و بەرپەرچدانەوەکانیان
بە ئەزموونی دەولەت لە وەی کە چۆن گەماروی بزووتنەوەکە بدات ، چۆن هێزەکانی کۆبکاتەوە ، چۆن پەلامار بداو
هاوولآتیان بکات بە گژ ڕاپەڕیوانداو تۆلە بسەنێتەوە لەوانەی ئەکەونە بەردەستی

**بژی بزووتنەوە ڕادیکالیەکانی پڕۆلیتاریا لە هەموولایەك**
**بەرەو بەرفراوانکردن و قولکردنەوەی بزووتنەوەکەمان دژ بە سوپا ، بە کرێکاری، بە نەقابە ، بە کەنیسە ، بە بانق، بە مزگەوت، بە ڕاگەیاند ، بە پەرلەمان، بە یاساو هەموودام و دەزگاکانی تری دیکتتاتۆریەتی سەرمایە**
**بەرەو شۆڕشی جیهانی پڕۆلیتاریا**
**بەرەو کۆمۆنیزمی جیهانی**



دوونموونەی جیاواز لە خۆبەدەستەوەدان، لە چۆکدادان، لە چاوەڕوانی، لەهێزی دیمۆکراسیەت و بەهێزی دەولەت





بۆیادگاری . به داخەوه شانۆگەری وێنەگرتن بە قازانجی سوپا لە میسر شکایەوە . دەبابەکان یان بۆ
تێکشکاندن وەیان بۆ بەردەوامی خەباتن، نەك بۆ وێنەگرتن


ئەدرێسەکەمان:

BP 33 – Saint-Gilles (BRU) 3 – 1060 Brussels – Belgium

*important: don't mention the group's name)* E-mail: info [at] gci-icg [dot] org – Our press on Internet: http://gci-icg.org


***Comrades, this magazen is an expression of our struggling class, copy it, and spread it!*** <